دوروتی کارنگی / دیل کارنگی

# یاساکانی هاوسەرداری





و. لە فارسیەوە

جەبار تەنیا

## پێناسی کتێب

ناوی کتێب: یاساکانی هاوسەرداری

نووسینی: دووروتی کارنگی دیل کارنگی

بابەت: دەرونناسی

وەرگێڕانی: جەبار تەنیا

تایپ خەرمان جەبار

نۆبەتی چاپ: چاپی دووەم ٢٠٠٧

چاپ: چاپخانەی هێمن

تیراژ: ١٠٠٠دانە

ژمارەی سپاردنی (٦١) ساڵی ٢٠٠٦ ی پێدراوە.

**دەسپێك :**

کۆمەڵناسان وپسپۆڕان ئاکارو ڕەفتاری خێزان و پایەداربونی بەئافرەتەوە دەبەستنەوە، هونەرمەندان و نوسەرانیش نەخشەی گرینگ و دەسکاری ئافرەت بەبونیادنەرو هۆی بەرەو باڵاچوونی پیاوو پەروەردەی وەچە ئەدەنەوە پاڵی.

هەوڵی خاتو"دوروتی کارنگی " هاوسەری دەروونناس و نوسەری ناودار لەسەرلە بەری ئەم کتێبەی بەردەستت شاهێدی ئەوراستیەن، ئەوەی ئەیخوێنیتەوە داستانی خەیاڵی و وتەی بریقەدارو بیرۆچکەی فەیلەسوفانە نییە، بەڵکو بەرەنجامی ئەزمونەکانێتی لەکرۆکی ڕاستەقینەوە هەڵقوڵاوی توێکاری و یاداشتگەلێکی چەند ساڵەیە کەلەوانەیە دەیەها جار بەزمانە ماکەکەی خۆی لێی چاپکرابێتەوە زۆریشی لێ وەرگێڕراوەتە سەرزمانە جۆراوجۆرەکان، گەرلەسەرەتاوە بەرکولێکی چەند پەڕەیەکی سەرتایی بکەیت دڵنیابە تانەگەیتە ئەنجامی کۆتایی کۆڵی لێنادەیت...!

هەربەشێك لەم کتێبە دووبەشە، یەکەمیان ئەزمون و بەدوادا چونی نوسەرە لەژیانی هاوسەردارە سەرکەوتودا دەرخستنی هێمای سەرکەوتنی زۆرێك لەناوداران، دووەم دەربارەی ڕێسا کرداریەکانەو بەکاربردنیان ژیانێکی خێزانی سەرکەوتوو لەئامێز دەگرێت، ڕێنماییەکان ئاڵۆزو ڕێگەچارەی گران نین زۆرێك خۆیانیان پێ تاقیکردۆتەوە بەرەنجامیان تێدا دەسگیر بووە، یان هێند ساکارن پێت سەیرە چۆن ئەم سادەییە بەخەیاڵی خودی خۆتدا نەهاتووە...؟

هیوا خوازم ئێوەی تازە هاوسەرو نۆ بووك دووێنەری ڕاستەقینەی ئەم کتێبە بن، چەندین جار لەخوێندنەوەی تێر نەبن، لاوانیش هەمانشێوە لێی بەهرەمەندبن

❀ ❀ ❀ ❀ ❀ ❀ ❀ ❀ ❀ ❀ ❀

## ١...بۆیەرنامەو بڕیار هاوکاری مێردەکەت بکە

ســـاڵی ١٩١٠ز دوولاوی خوێندکارهۆدەیـــەکی هەرزانبـــەهای یـــەکێك لەخانوەکانی شاری نیویۆرکیان بەکرێگرت، لاوی یەکەم "دیل" بـەدڵێکی لێـوان لێو لەنومێد کێڵگە کشاوەرزیەکانی میـسوری جـێ هێشـتبوو هـاتبوە زانکـۆی نیویـۆرك، هاوشـان "وینتـی" لاوێکـی دێهاتیـەو هـاوڕێی "دیـل"ە، جیهـانی خواستەکانی گەلێك لەهاوڕیکانی پتر وبەر فروانترە، خوازیارە بێتە بەڕێوەبـەری یەکێك لەکۆمپانیا گەورەکانی ئەمریکا.

دیل کارنگی لێی ئەپرسێت: ئایا تائێستا لەبیری ئـەوەدایت چـۆن بـەو پێگەیە بگەیت ...؟

-بیرکردنـەوەو باسـکردنی تـەنها چـرکەیەك لەمێشـکم دەرناچـێت و هەمیشە خولیامە و هەرچیەکم پێبکرێ درێغی ناکەم و سڵ لەهیچ ناکەمەوە...!

ساڵانێك تێپەڕی بوو بەسـەر ئـەو شـەوەی "دیـل- وینتـی" ئەجـەوان خوانی دڵیان بۆ یەکدی واڵا ئەکرد.

ئێستا ئەو بەرێوەبەری گشتی کۆمپانیایەکی بەرهەم هێنانی پەنیرە .. لەرێگەی "دیل"ەوە ئەو بەرێزەم ناسـی و دیمانەیـەکم لەگەڵـدا سـازدا، کەچـاوم کەوت بەماڵەکەی هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئـەو خـانوە هەرزانبەهایـەدا نەبوو کە"دیل" بۆی باسکردم

یەکەمجارە "وینتی" ببینم ...وەك بڵێی ساڵانێکە ئەیناسم، لەخۆ ئەگۆڕانی نیشانەی لادێیی بونی بوو وەگەرنا هیچ دیاردەیەکی ئەوتۆی پێوەدیار نەبوو...

لەگەڵێدا دانیشتم و گوێم بۆ شل کرد، بەجۆرێك ئەدوا ئەتوت باسی کەسێکی دیکەم بۆ ئەکات .

- بەڵێ خانم ..ئەمڕۆ "وینتی " زۆر شادمانە ئەو گەیشتە ئەنجامێك سەردەمانێك لەهۆدەیەکی پەرپوتتدا ئەژیاو لەکەشتی ئارەزوەکانی سەولی ئەدا..!

ئەمڕۆ پێگەشتووە بۆتە سەرۆکی کۆمپانیایەکی مەزن .

ئەزانی ئەمەش چ مانایەك ئەبەخشێ ..؟

بوار بدە خۆم بۆت بدوێم :

ئەوسەردەمە ئەو خەیاڵ بڵاوی ئەئەکرد تەنها هێندەو بەس ...!

- بەڕێز ئەم ساڵانەت چۆن گوزەراندو چۆن لەپۆستی بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیای پەنیر سازی "بلومون"پاڵت دایەوە...؟

ئەوساڵانێك گەردو خولی بوو، بێنەوەی مۆڵەت بەرەوینەوەی خەندەی لێوەکانی بدات ووتی: کارم لەبەردڵگران بوو، هەمو کاتەکانم لەکۆمپانیادا تەواو ئەکرد، تەنانەت لەکاتژمێرەکانی کاتی ناخواردنیشدا بێ پسانەوە خەریك بووم.

- ببورەنامەوێ قسەکانت پێ ببڕم، بەڵام لەکۆمپانیادا کارت چی بوو...؟

- خزمەتگوزاری کۆمپانیایەکی فرۆشتنی خۆراك، دیارە ئەمڕۆ بەو جۆرە فرۆشگایە ئەوترێت "سوپر مارکیت" و هاوکاری کرێکارەکانیشم ئەکرد، بەرامبەر بەوەش کرێیەکی زیاترم هەبوو کەسیش پێزانین و

دەستخۆشیەکی لێ نەنەکردم، بەڵام گرینگ نەبوو بەلامەوە چونکە ئەمویست ئەزمونێك پەیدا بکەم، بیسەلمێنم بونم لەوان زیاترە..!

لەووتەکانی بەڕێز "وینتی" بۆم دەرکەوت ئەم لاوە زرینگە بەهۆشمەندی و هاوڕێیەتی سەرنجی کەسانی دیکەی بۆخۆی قۆرخ کردووە.

- بەڵێ .. کارم گەیاندە ئەوەی سەرۆك هەستی بەکارامەیم کردوو گەیاندمیە پۆستێکی باشتر، دیارە مافێکی زیاتر.

لەتەواوی ئەم بێنەو بەردەیەدا ئەو ئامانجەکەی خۆی وننەکرد تاسەرەنجامی بەمەبەست گەیاندووە، کەدیقەتداوەك بڵێی بۆکەسێك ئەدوێ بونی لەوشوێنەدا نەبێت، چونکە بەردەوام تۆنی ئاخاوتنەکانی ئەگۆڕی هەردەمەو بەجۆرێك.

- بەڵێ خانم .. ئەمڕۆ "وینتی" هەمان ئەو کەسەی لەبەردەمتان دانیشتووە، گەرچی ساڵانێکیش لەتەمەنم ڕابردووە بەڵام، پێم وایە بەفیڕۆم نەداوە، کەبیرلەڕابردوم ئەکەمەوە ، هەمان ئەو کوڕە لادێیەی لەهۆدەیەکی پەرپوتدا ئەژیام، ئەسرەوتم تاکو بومە بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیایەکی مەزن و خاوەنی سەروەت و سامانێك لەهیچم کەم نیە..

ئایا چۆن سەرکەوتنی بەدەست هێنا ..؟

بەڕای من تەنها هەوڵی لەڕادەبەدەرو هەورازی ڕێی سەخت و هەڵدێری کەندو لەندو خوێندنی باڵاهۆکاری سەرەکی نەبوون ،چونکە کەسانی دیکەش هەمان هەوڵ و تەقالا، یان سەرمایەی چاکو گونجاویشیان هەیە بەڵام، وەك ئەو سەرکەوتوو نەبوون.

پێم وایە جیاوازییەکەی لەگەڵ کەسانی دیکەدا ئەوەبێ کە ئەو ئەیزانی چی ئەوێت و بەرەو کوێ ملی ڕێ ئەگرێت، کارکردنی دوای کاتی

دیاریکراوکارگۆڕین ، موتالاّو توێکاری لەڕشتە تازەکانـدا ئـەوە ئەگەیـەنێ ئامانجێکی دیاریکراوی هەیەو شوێنکەوتەی بوەهەرچیـەکیش بێتـە کۆسـپ پێشگیری لیَ ئەکات و ڕوبەڕوی ئەبێتەوە..

*ئەبونی ئامانج گەورەترین کۆسپی ناکامیە، یان بیَ ئامانج و توێکاری، سوارکۆڵی کار ئەبن ، بـیَ بەرنامـەو پـێش بینـی بێنـەوەی ئەخشـەو پلانێکی بۆ سازدەن، هاوسەرداری ئەسازێنن، بـەم بـارە نـامۆو لافـاوە کێویـە بەگـژ کارەسـاتی ژیانـدا دەچـنەوەو لەڕەهەنـدی بازنـەی ئـەم نامۆییەدا خۆزیارن چەرخی ڕۆژگارهاوشانی مەرامەکانیان بسوڕێت...!*

خاتو"هیوود"دامەزرێنەرو بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکە ڕیکلام بـۆ ئـەوە دەکات ئەوانەی کاری نابەدڵیان هەیە ئـەم ئـەتوانیَ ڕێخۆشـکەری کـاری تریـان بێت..!

لەدیانەیەکمدا لەگەڵ ناوبراو ووتی:

گەورەترین کێشەی مـن وخوازیـارانم ئەوەیـە خۆشـیان نـازانن چـییان ئەوێت، ئەولەمیانەی وتەکانیـدائاماژەیکرد بـەوەی یەکـەمین هـەنگاویَ لـەڕوی هاوکاریـەوە ئەوەیـە ناچـاریان بکـەم تـا خواسـتەکانیان لەناخـەوە دەربێـت و ڕاستگۆیانە بەخۆیان بڵێن لەژیاندا چییان دەوێت و چ جۆرە بۆچـونێکیان هەیـە.. ڕونتر..وانەخرێنە سەرکار تاخواستەکانی خۆیانیان بۆدەرکەوێت ، بێگومان تۆیش ئەتوانی هاوکاری مێردەکەت بکەیت تانەخشەی ئایندەتان ڕیکو پێك بکێشیت و بزانیت لەژیاندا چیت دەوێت دوای سازدانی پلانێك ئامانجەکەت دیاری بکەیت.

"سمونیل و-استرلنگ"نوسەرانی کتێبی یاساکانی هاوسەرداری ئەڵێن :

چـۆنیەتی ئامانجەکـە هێنـدە گـرینگ نیـە، گـرینگ چـاوەڕوانی و ئومێدێکە هەردوکیان هەیانە بۆ پێکاندنی...!

دیـاره دوای گەیشـتن بەئامانجەکـە ئـارەزوی هاوبەشـی هەردوکیانـە لەپێداویستیەکانی هاوسەرداریەکی وێکچوو، لێرەدا پێناسەی نوسـەرانی نـاوبراو وەکخۆی ئەگوێزمەوە :

(...بنـــەمای بەختـــەوەری ژن و پیـــاو ئەوەیـــە ، بیروڕایـــەکی بەرجەسـتەکراویان بۆگەیشـتن بەمـەرام هـەبێت و سـڵ لـەهیچ شـتێك نەکەنەوە دریغی لەهیچ کۆششـێك نەکـەن و ئەخشەکێشـی ئاسـۆیەکی ئایندەبن، لەهەمو خۆشی ناخۆشییەکاندا هاوشان بن...)

"ویلیم گراهام "و هاوسەرەکەی گەواهیدەری ئەم مەبەستەن :

کۆمپانیای سوتەمەنی "بیل گراهام" نـاوبراو دامەزرێنەروبەڕێوەبـەری ئەوکۆمپانیا مەزنە ناودارەیە، گراهام سەروەت و سامانێکی گـەلێك زۆری تێـدا کۆکردۆتەوە و خاوەنی شەش منداڵ وکۆشك و تەلارو دەرامەتی لەبن نـەهاتوون، هیچ کەمو کورتییەکی ماڵی و داراییان نیەو لەتەمەنێکیدا بەم پلەیە گەیشتوون ئەتوانن لەبەری هەوڵ و ڕەنجەکەی خۆیان بخۆن.

لەدیمانەیەکمدا لەگەڵ "گراهام" لێم پرسی :

خاڵی سەرەکی سـەرکەوتنی ئەو چی بـوە لەژیانـداچ کەسـێك هانـدەرو ئەخشە سازی بووە ..؟

ووتی: هۆکاری ڕاستەقینە تەنها ئامانج و ئەخشەیەکی داڕێژراوی دەستی ژنەکـەم بوو ...

لێرەدا باکەمێك سەرنجی ژیانیان بدەین ...

"گراهـام "وخـاتو "مـارگری" دوای هاوسـەرداریيان دەسـت دەکەنـە مامەمەڵەی کڕین و فرۆشتنی خانو زەوی ، ئەم دوانـە ئەدەسمایەیـەك ئەئـەزمون دەربارەی کارەکەیان بـەڵام خۆشەویسـتی بویـە هـۆی پشـت ئەسـتوری و بـەرەو

مەبەستی بردن ئەوان لەدوکانێکی تەسك و بچوکداو لەسەرەڕێی بازاڕێکدا دەسبەکار بوون، لەسەرەتاوە "مارگری" لەناوەوە دائەنیشت و "پیل" سەرپێی لەدەرەوە موشتەری پەیدا ئەکرد، وردە وردە کاریان بەرەو بالآچور توانیان لەسەرپێی خۆیان ڕابوەستن و دەسمایەیەك پێکەوە بنێن تادەهات بەرەو باشتر ئەچون پاشان "پیل" لەمکارە بێزار بوو، کەوتنە بیرۆڕاوێژی کارێکی دیکە چونکە خاوەن دەسمایە بوون.

"گراهام" ئەڵێت:

هەرکاتێ پیاوەکەم بەرەو مامەڵەیەکی گەورە بچێت لەملاوە دانەیەکی تر ئەگرێتە دەست تابەقازانجی یەکێکیان ئەگەری زیانی ئەوی تریان پڕبکاتەوە تا ئێستا هەردو مامەڵەی خوازراو هەرلەقازانجدان، زۆر کەمیش ڕێبکەوێت زیان بێتە کایەوە هێندەش بۆلەدستدانی شتێك ڕۆ ناچێت بەمجۆرە ئەوان هەورازی سەرکەوتنیان بڕیوەو گەشتونەتە لوتکە ئەمەش لەسای کارو کۆششو هاوڕابوون، بێگومان هەرکەس بەپێی ئەخشەو پلانێك خۆی یەکلا بکاتەوە مەبەست ئەپێکێ و تەقە لەدەروازەی سەرکەوتن هەڵدەستێنێ کەمتر ڕێبکەوێت توشی ناکامی ببێت، پێچەوانەکەشی :

*(هیچ تیرێك بێ مەبەست و ئامانجێکی دیاریکراو نیشانە ناپێکێت...!)*

"هربت هاکز" ئەڵێت:

سەرگەردانی ، خەمۆکی، فاکتەری نیگەرانین ، بەبێ مەبەست بەگەمژەیی و گەوجی ملی ڕێ گرتن نەك هەرتەنها مایەی نیگەرانیە بەڵکو گەورەترین لەمپەرێکن بۆگەیشتن بەئامانج و سەرکەوتنەکان ...

پاش یەکەمین هەنگاو بۆهاوکاریکردنی مێردەکانتان سەرنجێك بدەن :

☜ قایل مەبە بێ مەبەست و گەوجانە دەستەو ئەژنۆ هەڵکورمێت سەربەدیواری کوێرەوەرییەکاندا بکێشێت و خۆ بخزێنێتە کونجی نائومێدییەوە.

*بەڕای خۆتان و مێردەکانتان چەمکی سەرکەوتن چییە...؟*

وەڵامەکەی لەکۆتایی سەرچاوەیەکەوە ئەدەمەوە کەمەبەستمە پێشکەشتانی بکەم..

پارە، کەسێتی ، ئاسودەیی دەرونی، خزمەتکردنی خەڵك : کاری ئارەزومەندانە ...هتد. یان بیرو ڕای خۆتان و مێردەکانتان لەمەڕ سەرکەوتنەوە هەرچی چۆنێکە تەنها لەم مەسەلەیە بەگومان مەبە چەمکی سەرکەوتن لای کەسانی دیکە مەفهومێکی هەمەلایەنی هەیەهەرکەسێك بەپێوەرە عەقڵانیەکەی خۆی گەزو جاوی ئەکات هەرکەس بۆخۆی لەگۆشە نیگای تایبەتەوە ڕاڤەیەکی بۆدانەتاشێت هەروەك بیرو ڕای ئێوەو کەسانی دیکە ١٠٠٪ وێك ناچن ، کەواتە دوقۆڵی دانیشن و ئەوە لێك بدەنەوە بزانن لەژیانندا چیتان ئەوێت ئەتوانن چ ڕێیەك بگرن کاتێ ڕێگە ئەدۆزنەوە ئەنجامەکە دیاری ئەکەن ئەوکات هاریکاری یەکتر بکەن تا لەلوتکەدا مەبەست بپێکن ، کەواتە لەڕوی ناسین شارەزابونی خواستەکانی ئەوەوە لەدەلاقەی ویست و حەزەکانی ئەوەوە ئەتوانیت پەی بەوە بەریت کە چەمك و ماناکەی چییە مێردەکەت خوازیارە چی فەراهەم بێنێت ...؟

## بەگەیشتنی تەنها ئامانجێك ووچان مەدە. پاش ئەنجامی یەکەم نۆبەتی ئەنجامی دووەم و سێیەمە

یەکەمین حەزو ئارەزوی (نیك الکساندر) ئەوە بوو کە بتوانێت خوێندنی بالآ بە ئەنجام بگەیەنێت کە لە خوێندنی (لسیانس) بالآترەواتە بەپلەی یەکەم هەژمارنەکرێت (نیك)لە هەتیوخانەیەکی کزو کەساسدا سەردەمی منالّی خۆی بەسەر بردووە، ڕۆژگارێکی سەختی گوزەراندووە، لەم خانەیەدا مندالآن هەر لە کاژێر پێنجی بەیانیەوە تا خۆرئاوا سەرقالّی کاری قورس و لە بەرامبەریشدا بە سکێ تێر و بەدەسك برسی .....!

(نیك) هەر لە مندالّیەوە هەلکەوتوبلیمەت بوو، توانای ئەوەی هەبو قۆناغی خوێندنی ناوەندی بە ئەنجام بگەیەنێت ولە خەلّوەتگەی هەتیوخانەوە یەکەم هەنگاو بنێتە جیهانی دەرەوەی خەلّوەتگە، ئەو بە ئاوات و ئامانجەوە وەدەر کەوت کە برەو بە جیهانی نوێ لە جیهانێکی نوێوە بدات لە ئامادەیی و کارامەیەکانی خۆی بەهرەمەند بێت

(نیك) دوای وازهێنان و وەلانانی خەلّوەتگە، باشترین کارێك توانی پەیدای بکات و خۆی لە ڕەهەندیدا بدۆزێتەوە کاری(بەرگ دورین) بوو یەکەمین کاری ئەم ئەوجەوانە بەو هەموو ئامادەیی کارامەییەوە شتێکی سادەو سانا نەبوو، زیادەکاری، واتە ئیشی سادەو بەرامبەر دەسکەوتێکی کەم و لەگەلّ ئەوەشدا کارێکی ماندو ئامێزو شەکەت هاوەر بوو.

کەچی (نیك) لەو جۆرە کەسانە نەبوو لا بۆ ماندو بون شل بکات و گوێ نەداتە ماندوبون، ئەو پانزە ساڵی تەواو بەم کارە قورسەوە شانی دایە ژێرو درێژەی پێدا، تا گەیشتە ئەو سەردەمەی یەکێتی کرێکاران دامەزراو لە ئەنجامی دەست بەکار بوون وهەوڵو کۆششدا مافەکانی یەکێتی کرێکاران بەرەو باڵا سەرچاوەی وەرگرت و بویە مایەی خێرو بەرەکەت .

(نیك الکساندر) وردە وردە لە شەقامی خۆش بەختی و کامەرانیدا هەنگاوی دەنا، لەگەڵ کچێکدا زەماوەندی کرد، تا گەیاندیە ترۆپکی حەزو ئارەزوە دێرینەکانی،ڕێنمایی ویارمەتی بۆ فەراهەم هێنا، ئارەزوە دێرینەکەی (نیك) خوێندنی دانیشگا بوو، لە سەرەتای زەماوەندەوە کارێکی مەحاڵ بوو، چونکە لە سەرەتای زەماوەندەوە (نیك ) بۆ ماوەیەکی کاتی کەمێ بێکاری بە خۆیەوە بینی ..

لە سەردەمی بێکاری (نیك) دا هاوسەرەکەی هانیدا بەو دەسمایە کەمەی کە پێیانە بیخەنە مامەڵەی کڕین و فرۆشتنی زەویو زارەوە تا دەسکەوتێکی باشتریان لێ وەدەستکەوێ بۆ سوربون و هاندانیش هاوسەرەکەی تەنانەت ئەنگوستیلەی هاوسەریەتیەکەیشی بۆ فرۆشت، بەم شێوە هاوکاریە دوو قۆڵیەش بوە هۆی باشتر بون و گوزەراندنی بژێوی و خڕکردنەوەی ئەو سارمایەیەی کە (الکساندر) لە (نپسیلوانیا) دایمەزراندپاش تێپەڕ بوونی دووساڵ ڕێژەی دارایی و سەرمایەیان ئەوەندە زیادی کرد کە (ترزا)ی هاوسەری (نیك) جەخت و پێداگری لەسەر ئەوە کرد (نیك) ئەو خوێندنە ناتەواوو نیوە ناچڵەی بگەیەنێتە ئەنجام و هانیدا بگەڕێتەوە بۆ دانیشگاو بەو پەڕی خۆشی و تامەزرۆییەوە خوێندنەکەی تەواو بکات .

(نیك الكساندر)تەمەنی گەیشتبوە سی وشەش ساڵ بەسەرکەوتووی نمرەی لە سەرو (لیسانس)ەوە بەدەست هێناو گەیشتە یەکەمین مەرامی کاری خۆی و بە یەکەمین ئاواتی شاد بوو .

بەڵام، (نیك) لە کات و ماوەی خوێندندا لە (ترزا)ی هاوسەری دانەبڕاو کەمتەرخەمی نەکرد بەو پەڕی گیانی هاوکارییەوە درێژەی بە خوێندن و کاری مامەڵەی کڕین و فرۆشتنەوە دا، بەردەوام بەرەو ئاسۆیەکی ڕونتر هەنگاویان دەنا ئەویش دروستکردنی خانویەکی جوان و ڕازاوەو بوو لە کەنار دەریا، زۆری نەخایاند ئەو ئاواتەشیان هێنایە دی.

☜ پێتان وایە ئەم دوو هاوسەرە ئیدی پاڵیان لێدایەوە لە تەڕ ئەیانخوارد و لە وشك ئەنوستن..؟ نە ء. نەخێر ئەوان دارێکیان چاندبوو ئەیانویست لە بەریشی بخۆن و لە سێبەریشی بحەوێنەوە، چونکە کچێکی جوان و خنجیلانەیان هەبوو ئەیانویست تەواوی پێداویستیەکانی بۆ دابین بکەن تاکۆتای خوێندن بە بەرزترین پلەی بگەیەنن.

ئەم دوو هاوسەرە ئەوەندە لە دڵی یەکدا بڕیاریان سور بوو ئەگەر هەرچی سەروەت و سامانیان هەیە بۆیان خەرج بکردایە بۆ گەیاندنی بەو پلە بەرزە هێشتا پێیان کەم بوو،ئەم ئاواتەشیان لە سایەی ئەو هاو دەنگی و هاو دڵیەوە بە مەرام گەیاند.

ئەو سەردەمەی من بۆ چاوپێکەوتنیان ڕۆیشتم :

گفتو گۆم لەگەڵ سازدان خانم (الكساندر) وەك هاوسەرێکی بێ خەوش و دایکێکی دڵسۆز کە هیچ سەر ئێشەو نەبونی و کەم دەرامەتی ئازاری نەدابوو بێ پەردە پێی ووتم :

" حاڵی حازر خۆم و هاوسەرەکەم لە بیمەداین .."

تا سەردەمی پیری زۆر بە ڕێکو پێکی بێ هیچ کێشەو گرفتێك ئێمە ئەژین، ئیدی لەوە ناترسین ڕو بە ڕوی قەیرانی کەم دەرامەتی ببینەوە، وەك ئەڵێن :

☜ پڕ بە دڵ حەز بە مردن ئەکەم، هەرچیم خواست و ئاواتم هەرچییەك بوو هاتە دی .. ڕاستت دەوێت هاوسەرم باش لێم تێئەگات و لە کارە هاو بەشەکاندا ڕاو بۆچونم لێ وەردەگرێت، زۆریش ڕێزم لێدەگرێت و هاو ڕاو هاوکارو هاو بۆچونی یەکترین و بە ڕاستی تام و چێژی تایبەتی لێوەر ئەگرم کاتێکیش لە خانم (ترزا)م پرسی : خانم .. چی بوە هۆی ئەوەی مێردەکەتان سوربێت لەسەر خوێندن و درێژەی پێبداٺ ..؟ .. من ئەمەم لە زمانی مێردەکەتانەوە بیستوە کە دەڵێت : هاوسەرم تەنانەت ئەنگوستیلەی دەزگیرانی خۆی بۆ فرۆشتووم ئایا وایە ..؟

- نیك .. هەرگیز پێی ئەوتبوم کە ئاواتی ئەو تەنها تەواوکردنی خوێندنە .. ئەو کاتێك کە لە خەڵوەتگەی هەتیوخانەو، سەردەمی سەختی ئەو ڕۆژگارەی ڕو بە ڕو بویەوە پێی ووتم : ئەنجا تەنها من بووم توانیم لە ئەندێشەکانی ئەو بگەم و خۆم بە خۆم بڵێم : (ترزا) کەسێك شەیدای شتێك ئەبێت توانای بەرگە گرتنی ئەهامەتیەکانی نابێت بەڕاستی غیرەت نییە بۆ من ئەگەر هیممەتێك نەکەم، ئەمە لە لایەك لە لایەکی تریشەوە وابزانم هیچ کەسێك حەز ناکات کە هاوسەرەکەی کەسێکی گێل و گەمژەو نادان بێت، کەواتە ژیان لەگەڵ کەسێکی هۆشمەندو بە تواناو ڕۆشنبیردا بە لای کەمەوە یەکێك بوو لە حەزو ئارەزەکانم و ئۆخژنی ناخ و دەرونم لە ڕاستیدا هاندانی ئەو بۆ تەواو کردنی خوێندن یەکێك بوو لە دامرکاندن وقایل کردنی هەست و ئەستی خۆم ..

دیارە حەق بە خانم (ترزا)یە کە ئامانجەکەی ئەو کەسەی بەرامبەری دیاریکردو زۆر بە وریایی و هۆشمەندیەوە پێکای ..

بە هەر دەرەنجامێك کە ئێوەش لێکی ئەدەنەوە، بۆ خۆتان تەنها ئەوەندە ئەڵێم :

☜ بەرێزان (نیك و ترزا) برەویان بە ژیانی خۆش و کامەرانی ئەداو سەرگەرمی هەوڵ و کۆششێکی هاوبەش بونو تەقەیان لە دەرگای سەرکەوتن هەڵئەساندو هەوڵەکانیان پوچ و بێهودە ئەبوو بە دوریشی نازانم ئەم دوو هاوسەرە بڕوای تەواویان بە ووتەکانی هۆنەرو نوسەرو ناوداری ئینگلیزی (برناد شۆ) هێنا بێ کە ئەڵێت :

" .. من لە سەرکەوتن ئەترسم سەرکەوتن واتە گەیشتن بە لوتکە، سەرکەوتن واتە:کۆتایی ڕێیەو .. تەواو بونی جیهانی خواست و ئارەزوو .. کەواتە : سەرکەوتن لە بەرەنجام گەیشتن کتومت هەر وەك و ڕەفتاری جاڵجاڵۆکەی مێینەیە : چونکە جاڵجاڵۆکەی نێرینە بۆ گەیشتن بە ئاواتەکەی کە مێینەیە بەردەوام لە هەوڵو کۆششێکی بێ ووچاندایە کە بگات بە مێینەکە کەچی بەهۆی مێینەکەوە لە بەین ئەچێ .

من بە ئاواتەوەم. ئاوات و ئامانج هێشتا درێژ خایەن و بەردەوام بێت خوازیارم هەمیشە ئامانجەکە لە بەرچاو بگرم بۆ گەیشتنیشی لە هەوڵدا بم .

گەیشتن بە ئامانجیش واتە پایانی گەشت (سەفەر) ئاواتە خوازم هەمیشە لە سەفەردا بم .."

لە ژیاندا کەسانێکی زۆر وێڵ و سەر گەردانن ..

نە لە خەودان، نە بێدارن ..تەمەنێك ئەگوزەرێنن بۆ ئەوەی هیواو ئامانجێکیان هەبێت بەردەوامی برەو پێدانی ژیان واتە هەبوونی ئامانج، بەڵام، بێ ئامانج، بەرەو کوێ ..؟

کەسانی بێ ئامانج وا ئەژین، کە ئەتوانن بژین،گرفتاری جۆرەگوزەرانێك بێ ئەوەی هەست بەو تام و چێژە بکەن تەمەنەکەیان بێهودە لە دەست دەچێ، دیارە کەسانێك خاوەنی ئەو تام و چێژەن کە هەوڵو کۆششێکی زۆر لە پێناوی ئامانجەکەدا ئەخەنە گەڕ،دیارە کە سود مەند ئەبن لێی.

ئامۆژگاریتان ئەکەم : شان بە شانی یەکتر بەرنامەی ئاینده دارێژن خۆتان و هاوسەرتان هۆشیاربن، هەرهیچ نەبێ نەخشەی ژیانتان بۆ تەنها پێنج ساڵ دارێژن، بۆ نمونە ئەتوانی بەم شێوەیە بەرنامە ڕێژی بۆ بکەیت

".. لە پێنج ساڵی ئاییندەدا .. هاوسەرەکەت ئەبێت پلەیەك لە دانیشگا بە دەست بێنێ، پێویستە کۆمەکی بکەم تا کارێکی گرنگ بەدەست بێنێ خۆ پێنج ساڵ بۆ ئامادەکردنی ئەو کاتم هەیە .."

خانم (هی وود) کە لە بەندی پێشوودا پێم ناساندن لە زاری هاوسەری یەکێ لە کڕیاریەکانیەوە ئەڵێت :

".. هیوادارم هاوسەرەکەم هەرگیز بە سەرکەوتنی خۆی قایل نەبێت بەو سەرکەوتنەش ڕازی نەبێت، ئێمە نزیکەی پێنج ساڵ ئەبێت زەماوەندەکەمان سازکردووە هەر ساتێك بگرین لەم پێنج ساڵە هاوسەرەکەم ئامانجێکی تایبەتی تێدا بە دەست هێنانەوە ئەوە بوو ساڵی یەکەم پلەی پزیشکی وەدەست هێنا، ساڵی دووەم و سێیەم دوو خولی تایبەت مەندێتی پاشان ساڵێك بە خۆڕایی کاریکردوو ئەم ساڵیش گەیشتۆتە کاری مەبەسیت و ئەمڕۆیش ڕۆژێکە کە پێم بڵێت بە ئەندازەیەکی تەواو خاوەنی دارایيەکی تەواوەو چونکە زانیاری و ئەزمونی تەواوی وەدەست هێناوەو کۆتایی مانگی هەنگوینیمانە حەزیش ناکەم هەرگیز مانگە هەنگوینیەمان کۆتایی پێ بێت .

كاتێك بە ئامانجێك ئەگەم، خۆسازدانەوئامادەیی ئەخشە سازیەكی تر بەر جەستە ئەبێت ژیانمان پڕ ماناترو چالاك بەخش تر ئەبێت لە سایەی ئەم جۆش و خرۆشەوەیە كە سەركەوتنەكانمان زامن تر ئەبێت

بەم شێوەیە لە ئێوەی خانمان داواكارم لە كۆمەك و یارمەتی هاوسەرەكانتان دریغی ئەكەن، تا دەگەنە ئامانجێك و كە گەیشتن ئامانجی ئایندە لە پێش چاو بگرن لە ڕێی گەیشتن بەم ئامانجەشەوەیەكە درێژە بە هەولو كۆششەكانتان هەمیشە بەردەوامە ئەوەش لە یاد ئەكەن كە پێویستە ئەم كارە بە زیرەكی و هۆشیاریەوە بە ئەنجام بگەیەنن لەوانەشە ئەو هاندانە لەگەڵ ئەستی هاوسەرتاندا گونجاو ئەبێت، بەڵام پێویستە هەمیشە وا هاندەری بێت كە لەبەر خاتری تۆ دەست بە كارە تێیدا چونكە گرنگ ئەنجامەكەیە، یان چ ناتەواوی و كەم و كورتیەك هەیە ئەگەر وابزانێ لە پێناوی تۆدا فیداكاریكەو خۆی بەخت ئەكات..

## ٣... خانم

### ـ ئایا هیچ شتێ لە بارەی خۆشەویستی و ئەویندارییەوە ئەزانیت ..؟

".. باش نایەتەوە یادم کە چەند ساڵ لەمەوبەر بوو ..لەگفتوگۆیەکی ڕادیۆیدا لەگەڵ بەڕێز (فریدریك ویلیام سون) بەڕێوەبەری گشتی پێشووی ڕێگاکانی هێڵی ئاسن لە نیویۆرك ساز درا، بەڵام وشەکانیم هێشتا هەر لە یادەو فەرامۆشم نەکردووە لەو باوەڕەدام تا لە ژیاندابم هەرگیز لە یادی نەکەم. بەهەر حاڵ هەرچەندێك بە سەر ئەو مێژووەدا ڕابوردبێت گرنگ نییە، چونکە ئیستا بەڕێز (ویلیام سون) کۆچی دواییکردووە ئەمەوێت ووتەکانی کۆچکردوتان پێشکەش بکەم :

لەم ئاخاوتنە ڕادیۆییەدا گوێگران لە کۆچکردو (ویلیام سون)یان پرسی: ڕازی سەرکەوتنت لە چیدا ئەبینیتەوە ..؟

(ویلیام سون) بە چەند وشەیەکی سادە لە وەڵامدا ووتی :

- هەرچەندە کە ئەچووم بە ساڵەوەو تەمەنم ئەکرد بەو بیرو ڕایە باوەڕم بتەو تر ئەبێت ..کە خۆشەویستی بە یەکەم هۆکاری سەرکەوتن هەژمار ئەکرێت، سەرکەوتن ئەوەندە وابەستەی لێوەشاوەیی و زیرەکی و دانایی نییە، گەر کەسێکی لێوەشاوەو کارزان بە نابەدڵ دەست بە کارێك بکات هاوکات لەگەڵ یەکێکی دیکەدا دەست بە کار بێت، ئەوە بێگومان سەرکەتن لە کەسی دووەمدا ڕەنگی داوەتەوە شەوق و زەوق

واتە ئەوەی بیرو ڕای تەواو بە کارێك بۆ بە ئەنجام گەیاندنی، شەیدایی و تامەزرۆ بوونی، ئێستا گرنگ نییە ئەو کارە پاچ کاری بێت یان بەڕێوە بردنی وەزارەت بێت ..

کەسێك کارەکەی بەدڵ و بە گیان ئەنجام بدات، هەرچەند سەخت و نا هەمواریش بێت مادام بە دڵی خۆیەتی ئەوا مایەی خۆشی و کامەرانیەتی، ئەستێرەیەکی پرشنگ دار بە ئاسمانی چارە نوسیەوە ئەدرەوشێتەوە کەسێك بە دڵ و بە گیان حەز لە کارەکە بکات

(ئیمیرسون) فەیلە سوف و هۆنەری ئەمریکی ئەڵێت :

هیچ مەبەستێکی گرنگ بە بێ جۆش و خورۆشێك نایەتە دی و بە ئەنجام ناگات ..

خانمی خۆشەویست نێوەش دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە کاریگەریەك کارتان تێنەکات تەنها ئەخشەیەك بکێشن، ئەخشەیەك بە دەرك و پەی بردنی ئەو جۆش و خرۆش و قایل بونە پێی کە کارێکە نێکجار گرنگ و پەیوەندی تەواوی بە خۆشبەختی و کامەرانی خۆتان و هاوسەرانتانەوە هەیە.

چونکە ئەو جۆش و خرۆشە بەهرەیەکی خوداییەو بەخشیویەتی و چاوەڕوانی پاداشتەکەی نییە، تامەزرۆیی و خۆشەویستی کۆمەڵە سیفاتێکن تەواوی پیاوانی سەرکەوتو لێی بەهرە مەند بوون، هەر کەس بە جۆش و خرۆشێکەوە کارەکەی خۆی ئەنجام بدات، دەست خۆشی و ئافەرین بارتەقایەتی و کامەرانی لە ئامێز ئەگرێت، ئیدی گرنگ نیە ئەو کەسە دانیشمەند و داهێنەر یا کاسب و پیشەوەر یاخود ئافرەتی ماڵەوە بێت

پیاوەکە بە چێژو گەرم و گوڕیەوە ئەگەر کێویش لە بن و بێخ دەربێنێت هەست بە ماندو بوون ناکات .

پرۆفیسۆر (ویلیام لاین فلیپز) مامۆستای مێژووی دانیشگای (یال) کە لە ڕیزی دانیشمەند و دانایانی ئەم زانکۆیەیە تا ئاستی پەرستن خۆشیان ئەوێت ئەو لە کتێبەکەیدا بە ناوی عەشق بۆ وانە وتنەوە ئەنوسێت " بە لای منەوە وانە وتنەوە بلند ترین و بالآترە لەو کێشەو هەوڵەی بۆ بە دەستهێنانی بژێویە، وانە وتنەوە لای من واتە ڕاڤەکردنی ژیان، واتە هەبونی هیواو مەبەست .. واتە عەشقی و پەیوەندی هەروەك چۆن وێنەکێشێکی عاشق و ئەویندار لە ڕێگەی تابلۆیەکەوە هەست و سۆزەکانی بەر جەستە دەکات شاعیرێکیش بە شیعرەکانی و گۆرانی بێژێکیش بە ئاوازەکەی شەیدایە، منیش شەیدای وانە وتنەوەم بەو جۆرەی ئەوان شەیدای هونەرەکەیانن "

هەموو بەیانیەك بەو هیوایە بێدار ئەبمەوە بتوانم بە دیداری قوتابیەکانم شاد ببمەوە، تامەزرۆیی دیتنەوەیان مانای ژیان بەرجەستە ئەکات نازانم چۆن پێناسەی ئەو تامەزرۆییە بکەم کاتێك ئەچمە زانکۆوە.

ئەو ڕۆژەی ڕۆژی پشودانە ئیدی بیانویەك بۆ لە خەو بێدار بونەوەم بەدی ناکەم، هەر وەك کەسانێکی نائومێد ئەمسەرو ئەوسەر ئەکەم .

ئەگەر ئێمە بە کاری ڕۆژانەی خۆمان دڵ خۆش ببین پەیوەندی بەردەوامی بۆ دوپات بکەینەوە هەم خۆمان لە بەرەنجامی ژیانی خۆمان ڕازی ئەبین هەم کەسانی دیکەش بە چاوی ڕێزەوە تێمان ئەڕوانن .

ئەوجا ئەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی ئەرکی ئێوەی خانمانیش ئەوەیە لە ناخ و دڵی مێردەکانتاندا ئەو شەیداییە بەردەوامە چەکەرە پێبکەن، هەروەك ئەخۆشی کاتی چۆن بەردەوام لەگەڵ مرۆڤدایە و ئازاری ئەدات شەیدایش بە پێچەوانەوە هەمیشە بەرەو بەختەوەری ئەبات

دیارە ئەپرسیت ئەم كارە چۆن ئەنجام ئەدرێت ..؟ پەلە مەكە لە لێكۆڵینەوەی ئایندەدا (شەش رێسای گرن) تان بۆ باس ئەكەم تاكو بتوانن لە نێو دڵ و دەرونی مێردەكانتاندا رەنگی پێ بدەنەوە، بە تەواوی وا لە مێردەكانتان بكەن تاكو شەیدایی بۆ كارەكەی دەر ببڕێت بە خراپی نازانم ووتەكانی (والتر كرایسر)ی كە لە ئوتێل سازی جیهاندا جێگەی بەر چاوی خۆی هەیە بۆتان بگوێزمەوە كاتێك كرێكارەكانم ئەورووژێن ئەوكاتە من جەژنەو ئاهەنگ ئەگێڕم . هەر بۆیە ئەم كارە شوێنەواری تایبەتی خۆی لەسەر كرِیارەكانی بەجێ دەهێڵێت و بە وجۆرەش ئەتوانین كاسبیەكی تێرو تەسەل بكەین

با ووتەكانی بەرێز (وول ورس) یش بڵێین ئەم بەرێزەش دامەزرێنەرو پایە گوزاری ئەو فرۆشگا مەزنانەی ئەمریكایە كە تایبەتە بە فرۆشتنی كەلو پەلی ناو ماڵەوە داهێنانەكانی فرۆشگاكەی گەیاندۆتە ئاستی باڵا و ئەڵێت :

" مرۆڤ ئەگەر بە ئیشتیاو جۆش و زەوق بێگانە بێت، ئەوا سەركەوتن لە هەموو كارە كانیدا دەبێت شتێكی مەحاڵ .."

فاكتەری سەرەكی و گرنگ جۆش و حەزو زەوقە دەبنە هۆكاری كامەرانی دیارە من ئەوە ناڵێم كاتێ مەیل و ئارەزوی گوێ گرتنی مۆسیقایانە نییە، دەست بكەنە هەڵەكە سەما .. بە زۆر خۆتان بساچێنن و بە زەبری حەزو زەوق ئاهەنگ بگێڕن، مەبەستم كارێكە پڕاو پڕی حەزو ئارەزو بێت هاوكات چ لە رووی مەعنەوییەوە چ لە رووی مادییەوە باڵا ترین ئەنجامتان دەزگیر ئەكات

دیارە حەق بە دەستی بەرێز (وول ورس)ە چونكە شەیدایی و حەز تەنانەت لە بوارێ زانست و هونەریشدا رۆڵی سەركەوتویان هەیە

(سراد وارد ئاپلتون) پسپۆڕی بواری فیزیکی و بە دەستهێنەری خەلاتی (نۆبل) دەزگایەکی هێند مەزنی داهێنا کە توانای گواستنەوەی شەپۆلە دەنگەکانی هەیە بۆ شوێنە هەرە دورەکانی جیهان .

ئەم زانا فیزیکیە مەزنە لە ڕیپۆرتاژێکی بلاو کراوەی (تایمز)دا ئەڵێت :

".. من داهێنان و دۆزینەوە زانستیەکان و سەرکەوتنەکانم بە قەرز داری حەزو ئارەزوەکانم ئەزانم نەك بەو تایبەتمەندی و موتالاو توێژینەوانەی لەو زەمینەیەدا هەمبون، چونکە بەبێ حەزو بەدڵ بوون ئەو هەموو توێژینەوەو لێکۆڵینەوانە کاڵ و کرچ و مەحاڵ بوون .."

لە وانەیە سەرنج دانی ئەم وتانە لە زمانی کەسێکی سادەو ئاساییەوە شتێکی گاڵتە جارِ بێت، بەڵام کاتێ کەسێکی وەك (سراد وارد ئاپلتون) دەر ببڕێت چەمك و واتایەکی قوڵتر بەر چاو ئەخات

کاتێك ئەم حەزو ئارەزوە هێندە کاریگەری هەبوو دەبێتە هۆی ئەوەی پیاوانی مەزن بۆ هەمیشەیی نێوی خۆیان لەسەر ڕوپەڕەکانی مێژوو تۆمار بکەن حەتمەن بۆ مێردەکانی ئێوەو مێردی من و هەموو کەسێکی دیکەش هەر وایە

بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی مەبەست مۆڵەتم بدەن تیشکێك بخەمە سەر سوچێك لە ژیانی بەڕێز (فرانك بتگر) یەکێکە لە پیاوە هەڵکەوتوەکان و کەسێکی سەرکەوتوە لە ژیاندا ..

بەڕێز (بتگر) بە وشە گەلێك هاتە گۆ وەك ئەفسانەیەك کڕیارێکی زۆری ڕاکێشابور بۆ دامەزراوەی (بیمە) تا وایلێهات بوبو بە کۆمپانیایەکی گەورەی (بیمە) .

ئەو بە تەنها قسەیەکی خەڵکی وای لێ ئەکرد حەز لە (بیمە) بکەن، ئەو بەرەنجامی ئەزمونەکانی خۆی لە کتێبێکدا بە ناوی (لە ناکامیەوە چۆن بگەینە

لوتکەی سەرکەوتن) ئەم کتێبە بەڕێز (بتگر) هێندە پێشوازی لێکرا ئەتوانرێ بوترێ لە مێژوی کتێب فرۆشی ئەمریکادا کتێبی وا پێشینەی نەبوو ..!
بۆیە لێرەدا چرپەیەك ئەدرکێنین :

" ..لە ساڵی ١٩٠٧ دا تازە لە ئەندامێتی تیمێکی (بیس باڵ) دا دەرکرابوم .. وەدەرنانم لەم تیمە زەبرێکی کاریگەری دەرونی لێوەشاندم هەربۆیە ڕۆژێك سەرۆکی وانەکەو ڕاهێنەری تیمەکە ئاگاداریان کردمەوە ووتیان : فرانك .. بۆ خاتری خودا لە خەو بێدار ببەرەوە ..!

کەمێك جۆش و خرۆش بدەرە بەر خۆت، تا کەی ئەتەوێت بە زۆر و بە بێ مەیل و ئارەزوی خۆت بێیتە مەیدانەوە ..؟

ناچارین لە بەر ئەوەی هیچ جۆرە مەیل و ئارەزویەکت لەم کارەدا نییە، ئێمەش لەم تیمە دەرت بکەین ..!

کرێی مانگانەم ١٧٥ دۆلار بوو.. کە لە دوای دەرکردنم لەم تیمە ئیدی ماتەمینی دایگرتم، ئەم بڕە پارەیە لە کوێوە دابین بکەم ..؟ ڕێگە چارەیەکم شك نەئەبرد جگە لەوەی بچمە شارێکی دیکەوەو پەیوەندی بە تیمێکی دیەوە بکەم، پاش ماوەیەك سەرگەردانی ڕۆیشتمە (بنسلڤانیا) و پەیوەندیم بە تیمێکی وەرزشگای گەورەی (ئەتلانتیك)ەوە کرد لەم تیمەشدا تەنها بڕی ٢٥ دۆلاریان بۆ دابین کردم بێگومان ئەم بڕە پارە کەمەش نەیئەتوانی گەش بینم بکات و کەم و کورتیەکانم بۆ تەواو بکات..

بەڵام، من بڕیارم دابوو ئەبەردی بنوێنم یان هیچ نەبێت وا خۆم نیشان بدەم جۆش و زەوقێکم هەیە، لە دوای دە ڕۆژ ڕاهێنەرەکانی تیمەکەو سەر پەرشتیارانی یانەکە بڕیاریاندا بمنێرنە شاری (کنتیکا) لەلای (دنی می هان) یاریزانی کۆن و بە ئەزمون یاری بکەم، دوای دەرچونی ئەو بڕیارەش کەمێك بە خۆمدا چومەوەو

تێگەیشتم لەم یانەیەدا من نەناسراوم و کەس نامناسێت نەبێت ئەم هەلەش بە هەند وەر بگرم و خۆم بە کەسێکی چوست و چالاك بنوێنم و وای نیشان بدەم تامەزرۆی کارەکەمم، ئەوکات دەر ئەکەوێت کە چەند تامەزرۆی کارەکەمم و بەمەش ناو و شۆرەتم بە دەست هێنا و بونە مایەی سەرکەوتن و سەر فرازیم ..

هەر لە سەرەتای چونە گۆڕەپانەوە هەروەك پریشکی ئاگر بە ملاو لادا دەستم کردە یاری کردن هێندە بە گورو تینەوە پەلاماری تۆپەکەم ئەدا و ئەمفڕاند تیمی بەرامبەرم ناچار ئەکرد ئەوانیش ڕاکەن و پڕتاوی زیاتر بخەنە گەڕ بۆ تۆپەکە، لە ئەنجامی گوڕو تین و تامەزرۆیی من تیمەکەی ئێمە بە پلەی زۆر باش یاریەکانی ئەبردەوەو لە کۆتایدا من زیاتر لە هەموو ئەندامان شەکەت و ماندو تر ئەبووم کە پشوم ئەدا هەرگیز هەستم بە ماندو بون نەئەکرد لەوانەیە وابزانیت ئەم ڕەوشتە تەنها لەو کات و ساتەدا کاریگەری نواندبێت، یاخود بە ڕێکەوت ئەو شوێنەوارە گرنگەی هەبوبێت .. نە ء. بە هەڵەدا ئەچیت ئەم ڕەوشە نەك تەنها بۆ هەمیشەیی شوێنەواری خۆی بەجێ هێشتبێت، بەڵکو بۆمن موعجیزەیەك بوو لەو ڕۆژەدا سێ مەسەلەی گرنگی لێکەوتەوە .

- یەکەم : ئەوەی حەزو زەوق زاڵ بوون بەسەر دڵە ڕاوکێ و ترسدا من هەزار جار زیاتر پێم وابوو لێوەشاوەم لێهاتو تر بووم.
- دووم ئەو حەزو ئارەزوەی من لە دەرونی یاریزانەکانی تریشدا چەسپاو ئەوانیش بەو گوڕو تینەوە یاریان ئەکرد.
- سێهەم : ماندویەتی و شەکەتی و کێشەکانی گۆڕەپانی یاریەکە نەك هەر لە گۆڕەپاندا، بەڵکو هەر لە هاتنە دەرەوەم لە گۆڕەپان هەستم بە هیچیان نەئەکرد .

بۆ ڕۆژی پاش ئەوە سەر لە بەیانی کاتێ ڕۆژنامەی ئەو ڕۆژە گەیشتە دەستم
خۆشحاڵی و وروژاندا هەموو گیانم ئەلەرزی.

پەیامنێری ڕۆژنامە نوسیبوی :

" بتگر، ئەم یاریزانە نوێیە، کانگای جۆش و خرۆش و تین و تاوی ئەبڕاوە ئەو شەیدایی و حەزی ناساند بە یاریزانەکانی شارەکەی ئێمە، بو بە هۆی ئەوەی ئەك تەنها یاریەکە ببەنەوە، بەڵکو لە تەواوی ماوەی تەمەنیدا ئەم یاریە سەرکەوتوەی ئەمڕۆ هەرگیز فەرامۆش نەکەن، ئەوان لە تەواوی ژیانی وەرزشیاندا هەرگیز یاری بە وەها شێوەیەکی سەرکەوتوانەیان نەکردووە.

دە ڕۆژ زیاتری بە سەردا نەچو بوو لە ساڵی بەهۆی حەزو زەوق و نارەزووە مانگانەکەم لە ٢٥ دۆلارەوە بویە ١٨٥ دۆلار واتە زیاتر لە حەوت بەرامبەر، پاش تێپەڕ بوونی دوو ساڵ مانگانەکەم لە سی بەرامبەر تێپەڕی کرد و ئیدی ئەم سەرکەوتن و خێرو بەرەکەت و ناو و شۆرەتە تەنها و تەنها بە قەرزار یاری حەزو زەوق و نارەزو ئەزانم .

خراپ نییە گەر بزانیت بەڕێز (بتگر) لە ترۆپکی سەرکەوتن و ناوداریدا لە کاتی یاریەکەدا دەستی ڕاستی زەبرێکی توندی بەرکەوت زۆر بە سەختی بریندار بوو ئەمەش بویە هۆی ئەوەی چیدی نەتوانێت لە یاریەکانی (بیس باڵدا) بەشداری بکات و ئیدی ماڵئاوایی لە دنیای وەرزش خواست و ئەمجارەیان بەرەو کۆمپانیای (بیمە) و بە فرۆشتنی کۆبونی بیمەوە خۆی خەریك کرد هەرچەند لە سەرەتاوە سەرکەوتن یاوەری نەبوو، بەڵام چونکە ئەو ئەزمونەی لە یاری (بیس باڵدا) وەدەستی هێنا بور چێژی لێ دیتبوو ئەویش حەزو نارەزو بۆ کارەکەی سەر لە نوێ لەم کارەشدا دایڕشتەوە، ئەمجارەشیان گەیاندیەوە ترۆپکی سەرکەوتنێکی دیکە .

ئەمرۆ( فرانك بتگر )یەکێکە لە نوسەرو وتاربێژە پلە یەکەکانی ئەمریکاو ئەتوانێ لە بەرامبەر هەزاران بیسەرو بینەردا بە تواناو بوێرییەکی تەواوەوە وتار بدات و هەموو کەسیش بە تامەزرۆییەوە گوێ بیستی وتەکانی ئەبێت و بە تاسەوە نوسینەکانی ئەخوێنێتەوە . ئەو ئەڵێت:

(... لەماوەی سی ساڵی ڕابردودا، سەرگەرمی فرۆشیاری بیمە بووم، بە چاوی خۆم سەدەها کەسم لە هاوکارانم بینیوە لە ئەنجامی حەزو ئارەزوە سەرکەوتنیان بە دەست هێناوە کۆمەڵێکی زۆریشم لێ بینیون کە بە ساردی و بێ ئاگاییەوە دەستیان داوەتە کارەکانیان و شکستیان خواردووە، ئەوانەی لەم بەهرە خوداییە بەهرەمەند بوون گەیشتونەتە ترۆپکی سەرکەوتن و ئەوانیشی لێی بەهرەمەند ئەبوون تامی کامەرانیان نەچەشتوە و دەستیان لە کار کێشاوەتەوە.

هەر بۆیە ئامۆژگاریتان ئەکەم ئەو دیاردانەی لە بەڕێز (فرانك بتگر) دا ڕەنگی دابویەوە ئێوەش بیگەیەننە مێردەکانتان و بە شێوەیەك پێیان بگەیەنن ئەو جۆش و خرۆشە تاکە فاکتەرێکی گرنگی ئارەزوی مرۆڤە و، ئەگەر مێردەکانتان بە ئەندازەیەکی تەواو و حەزو ئارەزو کارەکەی بگرێتە ئامێز ئەوەك هەر تەنها سەرکەوتن لە ئامێز ئەگرێت، بەڵکو هەست بە ماندو بون و تەمەڵێش ناکات

کەسێك لە کوڕەکەی (بوب کروسبی) مۆسیقارو ڕابەری ئۆرکسترای پرسی :

باوکت بە چ کارێکەوە سەرگەرمە ..؟ کوڕەکە وەڵامی دایەوە :

- بە خۆشی و کامەرانی

پیاوەکە دوبارە لێی پرسییەوە .. زۆر چاکە تۆیش کاتێك گەورە بویت چ کارێك ئەکەیت ..؟

کوڕکە بێ چاوەڕوانی و وەستان ووتی :

- خۆشی و كامەرانی

كوڕەكەی (كروسبی) چونكە هێندە مەیل و ئارەزوی لە كارەكەی باوكی بوو ئەیزانی باوكی هێندە شەیدای مۆسیقایە كاركردنی بە خۆشی و كامەرانی پێناسە كرد.

كەسانێك كە بە مەیل و ئارەزووەوە كارەكانیان ئەنجام ئەدەن لە ناخیاندا مایەی خۆشی و كامەرانی ئەنوێنن ..

ئێوەش گەر حەز ئەكەن هاوسەرەكانتان سەركەوتوو بێت و بە سەركەوتووی بمێنێتەوە لەم خۆشی و كامەرانیە لە دڵ و دەرونیاندا برووێنن

پاشان شەش رێسای كاركردنی كرداری كە لە بەندی ئایندەدا بۆتان شیتەڵ ئەكەم كاری پێ بكەن تا تەرازوی حەزو ئارەزوی پێ باڵا بكەن و لە دوایدا سەركەوتنی پێ زامن بكەن ..

## شەش" ڕێسای کرداری بۆ بەرز کردنەوەی حەزو ئارەزو

بێگومان ئەو شەش ڕێسایەی کە مەبەستم ڕونکردنەوەیەتی کاریگەریەکی فراوانی لەسەر باڵابردنی کێشانەی ئەوانەی کاری پێنەکەن، چونکە ڕێساکان چەندەها جار شایانی تاقیکردنەون و بەرەنجامی سەلمێنراویان هەیە، لە لایەکی دیەوە ڕێساکان لە تاك و چ لە کۆمەڵدا بەرەنجامی وەدەست هاتوی ساڵەهای ئەزمون گەری دانایان و ئەندێشە مەندان کە دوای لە بێژنگ دانیان و پاکتاو کردنیان هاتونەتە بەر دەست،بە هەر حاڵ لە ڕاستێتی و ئەنجام بە دەستەوە دانیان گومانت نەبێ و دڵنیابە کە لە ١٠٠٪ ئەنجامت دەزگیر نەکات و تەنانەت لە ١٪ زیانت پێ ناگەیەنێت

بە پێناسەیەکی تر: بەرەنجامی تاقیکردنەوەی ڕێساکان ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی سود بەخش نەبن، بێگومان بچوکترین زیان بە ئەنجام دەرانی ناگەیەنێت.

بەم ڕونکردنەوەی کە خوێندتەوە تۆیش ژنێکی میهرەبان و هۆشمەندیت داوا لە مێردەکەت بکە ئەم شەش ڕێسایە تاقی بکاتەوە

پێش ناو ونیشانی یەکەمین ڕێسا ئەوەت لە بیر نەچێت خۆت پێویستە بە تەواوی ئاگاداری بیت و دەرکی پێ بکەیت، پاشان جێبەجێکردنی لە لایەن مێردەکەتەوە بخوازیت، چونکە بە بێ هەبوونی دەرك و زانیاری ناتوانیت پێداگیری لە کاریَ بکەیت بۆ مێردەکەت کە نازانی چییە .

## ڕێسای یەکەم :

بە مێردەکانتان بڵێن : وردبونەوە لە کارەکەیدا ئەنجام بدات، بەم ورد بونەوەیەش خۆی هەڵسەنگێنێت، بە کۆمەك و هاندانی ئێوەش ئەتوانێت دەرك بە هەموو پێچ و پەناکانی کارەکەی خۆی بکات.

زۆر لە خەڵکی گرنگیەکی ئەوتۆ بە کارەکەیان نادەن، بە گومانی خۆیان تەنها ماشینێکی ڕەق و تەقن تەنها بەرنامەیەکی کارکردنیان هەیەو مافیشیان هەر هەمان ئەو مافەیە کە دەستیان ئەکەوێت، چونکە هێندە بایەخیان پێ نەدراوەو پێی قایل نین دیارە ئەویش لە قاڵبێکی ڕەق و تەقدا وشك هەڵاتووە .

ئەم داستانە بچوکەش نیشاندەری بۆچونی ئەو کەسانەیە سەبارەت بە کارەکەیان دوو وەستای بیناسازی لە باڵا خانەیەکدا سەر گەرمی کارکردن بوون، ڕێبوارێك بە لایاندا تێپەڕی لە وەستای یەکەمی پرسی :

- وەستا چی ئەکەیت ..؟

وەستای یەکەم بە بێتاقەتیەکەوە تەماشایەکی کرد و ووتی :

- نابینی ئەم خشتانە هەڵئەچنم ..!

ڕێبوارەکە ڕویکردە وەستای دووەم و لەوی پرسی :

- وەستا ئەی تۆ چی ئەکەیت ..؟

وەستای دوەم بە ئاوازێك کە ئەیویست لە پرسیارەکەی بگەیەنێت کە ئەم لەگەڵ کەسێکی گرنگدا ئەدوێت وەڵام دایەوە :

- ئەگەر دیقەت بدەیت من خەریکی دروست کردنی کڵێسایەکی گەورەم ..!

زانیاری و ئاگادار بوونی تەواو لە هەر کارێکدا نەك هەر تەنها بڕوا بە مرۆڤ نەبەخشێت، بەڵکو ئەیخاتە سەر ڕاستە شەقامی حەزو ئارەزوش

بە خراپی نازانم ووتەکانی خانم (ایدا تادیل)ڕۆژنامەوانی بە ناوبانگی ئەمریکی ئەڵێت :

بۆ نوسین و ئامادەکردنی ڕاپۆرتێك کە ژمارەی وشەکانی لە هەزار وشەیەك تێناپەڕێت، ماوەیەکی زۆر موتاڵاو لێکۆڵینەوە ئەکەم هەتا لە هەموو پێچ و پەنای باسەکە زانیاری تەواوم چنگ ئەکەوێت و ئەمەش ئەبێتە هۆی ئاسانکردنی ڕاپۆرتەکەم و بە ورەو توانایەکی تەواو بڕوا بە خۆ بونەوە بە بێئەوەی هەست بە بێ توانایی و دەستە پاچەیی خۆم بکەم کارەکەم ئەگەیەنمە ئەنجام .

(بنیامین فرانکلین) فەیلە سوف و سیاسەت مەداری ئەمریکی : لە سەردەمی منداڵیدا لە کارخانەیەکی سابون سازیدا کاری دەسگێڕی سابون فرۆشی بوو ئەو هەرچەندە شارەزای بەشە هونەری و زانستیەکانی کارخانەکەی نەبو، بەڵام بە هۆی خۆشەویستی بۆ کارەکەی شارەزایی لە هەموو بەشەکاندا پەیدا کردو هەموو تایبەت مەندیەکانی فێر بوو.

ئەم هەوڵ و زانیاریە هێزی دڵی پێ بەخشی گەیاندیە لوتکەی سەرکەوتن، ئەو لە بەر ئەو زانیاریانەی لە کاتی دەسگێڕیەکەیدا بە دەستی ئە هێنا هەرگیز هەستی بە کەمی و زەبونی خۆی نەئەکرد کە کابرایەکی دەسگێڕە .

ئێمە هەرچەندە زانیاری زیاتر لە بارەی کارەوە بە دەست بێنین ئەوەندەش مەیل‌و ئارەزومان بۆ کارەکەمان زیاد ئەکات

بەم پێیەش گەر مێردەکەی تۆ دڵساردی بەرامبەر کارەکەی دەر ئەبڕێت و ئارەزوی کارەکەی ناکات هەوڵ بدات هۆکارەکەی بدۆزێتەوە، لەوانەیە زانیاری و ئاشنایی تەواوی لەگەڵ کارەکەی خۆیدا نەبێت یاخودئەو هۆکارانەی ئەیبەستێتەوە بە کارەکەیەوە پەیوەندیەکی ئەوتۆی لەگەڵیاندا نەبێت، ئەرکی

ئێوەش ئەوەیە مێردەكانتان هان بدەن لە بارەی كاری خۆیانەوە زانیاری زیاتر بە دەست بێنن .

## ڕێسای دوومەم :

مەبەست و ئامانجێك هەڵبژێرەو دیاری بكەو هەوڵی دۆزینەوەی ئەو ڕێگەیە بدە كە ئەتگەیەنێتە ئامانجەكە .

كەسێك خوازیاری سەركەوتن و كامەرانی بێت ئەبێت هەمیشە مەبەست و ئامانجێكی دیاری كراوی هەبێت، چونكە بەبێ هەبوونی ئامانج نیشانە شكێنی ناكرێت، ئەگەر ناتەووێت دوچاری شكست و ناكامی ببیت ئەبێ بزانی كار بۆچی ئەكەیت چیت لە ژیانا ئەوێت .

لێرەدا (بنیامین فرانكلین) ئەڵێت :

" .. سەركەوتن چارەنوسی كەسێك ئەبێت بزانێت چ كارەیەو ئەیەوێت چی بكات تا

گەیشتن بە مەبەست و ئەنجامدانی كارەكە درێغی لە هیچ هەوڵ و كۆششێك ناكات .."

ئەگەر (ساموئیل سیكور كالریج) هۆنەرو فەیلە سوفی ئینگلیزی لە سەردەمی خۆیدا ئەم پەندو ئامۆژگاریەی (فرانكلین)ی بزانیایە بێگومان كاری پێئەكردو ئەمڕۆ شاكارەكانی بە ناتەواوی بۆ ئێمە جێ نەدەهێشت.

زیاتر ئەو هۆنراوانەی لە (كالریج) بە جێ ماون زۆربەیان ناتەواون، ئەو هەمیشە حەزی ئەكرد شوێنەوارێكی گەورەو ئەمر بخولقێنێ، بەڵام ئامادەیی و لێهاتوییەكانی لە زەمینەی جۆراو جۆردا دابەش ئەكرد.

( چارلز لمپ) ڕەخنە گری ئینگلیزی سەبارەت بە (كالریج) ئەڵێت:

" (کالریچ) مرد، ئەڵێن نزیکە چل هەزار پەیامی ناتەواوی لە میانـەی نیلاهیان و فەلسەفەو پەند و دانایی،لێ بەجێماون، سەیر لەوەدایە تەنانەت هـیچ یەکێك لەو پەیامانە تەواو نین .."

خانمی بەڕێز :

ئەوەندە لەگەڵ مێردەکەتدا گفتوگۆ بکە تا تێبگەیت مەبەست و ئامانجی ئەو چییە ..؟

ئەو هان بدە لە جیاتی خەیاڵ بڵاو و ئارەزوی پەرش و بڵاو مەبەست و ئامانجێك لە جیاتیان دابنێت و بۆ گەیشتن بەو ئامانجەش زانیاری تەواو بە دەست بێنن ئەوەش لە یاد نەکەیت ئەگەر مێردەکەت خانویەکی خنجیلانەو ڕێك و پێك و تەواوت بۆ دروست بکات باشترە لەوەی هەزار ساڵ خانوت بۆ بنیات بنێت سەری هیچ کامێکیان نەگرێت

## ڕێسای سێیەم :

" هەمو ڕۆژێك وشەی ورەبەخش بەسەر زمانتدا بێت و خوتی لەسەر ڕابێنە لەوانەیە ئەم کارەش بەلای تۆوە منالآنەو گاڵتە جاڕ بێت، بەڵام گرنگ نییە .. گرنگ ئەوەیە بگەیتە ئەنجام و دڵنیا بیت لەوەی کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵکی بەختەوەرو کامەران بە گرتنی ئەم ڕێگەیەو سەرکەوتنیان بەم هەواڵە منالآنەیە لە ئامێز گرتوە .

بەڕێز ..أ.ج. وی کالتنبرون ئێستا ڕاڤە کەری سیاسی و کارناس و بێژەری هەواڵە گرنگەکانە و ئەڵێت:

کاتێ لە وولآتی فەرەنسادا بووم بۆ فرۆشتنی کالآکان ماڵ بە ماڵ ئەگەڕام پێش دەستپێکردنی کاری سەخت و ناهەموار.. ڕۆژانە وشە گەلێکی

چالاك بەخشم بەسەر زمانى خۆمدا ئەهێناو پرۆڤەم لەسەر ئەكردن، گەر كاريگەرى ئە و وشە چالاكى بەخشانە نەبوايە نەمئەتوانى درێژە بە كارەكەم بدەم ئێستاش لەسەر هەمان شێوە بەردەوامم، تەنها كاتێك ئەكەومە يادى ئەو رۆژانەوە لە كاريگەرى ئەو وشە چالاكى بەخشانە سەر سامم، لەوانەيە گومان بەريت گەزاف و زيادە رۆيى بكەم، بەلأم تا ئەو كاتەى نيستا پێتان ئەلێم كاريگەرى ئەو وشانەيە شوێنەوارى گرنگيان لەسەر بەجێ هێشتوم ئەو بوێريەى تێدا دروست كردوم ئەو هەوالەى دێتە بەر دەستم وەها راڤەى بكەم كاردانەوەى تەواو گونجاوى لەگەڵ هەوالەكەدا هەبێت

به پێناسەيەكى تر :

من ئەم بليمەتيەم لە خۆمدا هێناوەتەو كايەو بەرجەستەم كردووە كە رێنماى بەرنامە سازانى سياسى بم .

(هاوارد ترستيڤن)ى تەر دەست و سيحربازى بەناو بانگ خوى گرتبوو پێش دەركەوتنى لەسەر نمايشگا،لە هۆدەى پشت نمايشگاكەوە سەرو خوارى ئەكردو بە خۆى ئەوت :

" من شەيداى تەماشا چيانم "

(هاوارد) ئەم كردارەى هێندە دوبارە ئەكردەوە تاكو هەمو ئەندامەكانى گيانى گەرم دائەهات و تواناى گرتنى تەلى هەست و سۆزى ئامادە بوانى پەيدا ئەكرد،هاو كات؛ ئامادەيى تەواوى لە خۆيدا بەرجەستە ئەكرد ئيدى لەسەر نمايشگاكە خۆى دەر ئەخست و بەتين و ورەو بروابەخۆبونێكى بەرزەوە كارى دەسەو سانكەرو موعجيزەى ئەكرد كە زياتر لە سيحرو ئەفسانە ئەچوون

بروابكە كارى وەهام لێ بينيوە كە لە مێشكى هيچ كەسێكدا شايانى بروا پێكردن نييە ..

كەسانی وەك ئێمەش زۆربەی كاتەكانی بە خەوتن بەسەر دەبات، لە حاڵێكدا ژیانی ئەمڕۆ هۆشیاری و بێداری تەواوی پێویستە.

ئیدی بۆچی هەمو ڕۆژێك سەر لە بەیانی بەر لە ماڵ دەرچون و چونە سەر كار نەڵێین :

" من شەیدای كارم تەواوی هەوڵەكانی ئەمڕۆم بۆ كار ئەخەمە گەڕ كاژێرەكانی ئەمڕۆ لە كاردا خەرج ئەكەم و لە ژیانی خۆم ڕازیم و چست و چالاكم "

خانمی خۆشەویست :

لە كار پێكردنی ڕێسای سێیەمدا ئەركی ئێوەیە مێردەكانتان هانبدەن بەو چست و چالاكیەوە بچنە سەر كار .

## ڕێسای چوارەم :

ڕێنمایی پێویست بۆ كۆمەك كردنی كەسانی دیكە فێر ببەو، وانەی خۆت دابدە، تا لە كۆمەك كردنی كەسانی دیكەدا بێ كەم و كوڕ بیت.

(ارستۆ) فەیلەسوفی یۆنانی كە پێش لە دایك بونی حەزرەتی مەسیح ژیاوە ئەڵێت :

" هەستی خۆ ویستی خۆت ڕازی بكە " ئەم پەندە بۆ ئەوانەی تینوی كامەرانین ڕێسایەكی گەلێك بە كەڵكە

خزمەتكردنی خەڵكی ئەبێتە هۆی بە هێز كردنی چالاكی و شادمانی لە خودی خۆماندا لەوانەشە هەر بەم هۆیە بێت كە كەسانێك لە ڕێگەی كارگوزاریە خەیریەكاندا بە دەرامەتێكی كەم كارەكەن كەچی زۆر دڵ خۆش و قایلن و نارەزایی دەرنابڕن كەچی كارمەندێك هەرچەندمانگانەكەشی لەمانە زۆر ترە هەمیشە چاوی لەسەر كاتژمێری دیوارەكەیەو چاوەڕوانی هاتنی سەری مانگەو

چاوەڕوانی بۆ ڕۆژی سەری مانگیش سزاو تاڵاوێکی زۆری پێ ئەچێژێت و هەر بۆیە کەکەسی چاوەڕان کەر کەسێکی تەمەڵ و سست و بێ ئیرادەیە ڕێگەی سەر گەرمکردنی خۆیشی نازانێت و بە دەست ئەو بێت تەواوی سی ڕۆژەکەی مانگ یەك ڕۆژ بێت و ئەو ڕۆژەیشی بە یەك کاتژمێر لێبڕوات..

ئەم کەسە نازانێت بۆ بە هەدەردانی تەمەنی گرانبەهای خۆی پەلەقاژەیەتی و شتێك لە دەست خۆی ئەدات کەجارێکی دیکە بە دەست هێنانەوەی مەحاڵە،ئەو پێی وایە کلاوی لەسەر لێپرسراوەکەی خۆی ناوەو بێ ئەوەی کارێکی ئەوتۆیشی کردبێت مانگانەکەی وەرگرت..

بەلاّم بە هەردەردانی ئەو تەمەنە جوانە زرنگی نییەو بەڵکو نەفامیەو دڵنیاش بە کەسی ئاوا هەرگیزچاوی بە ناو چاوی کامەرانی ناکەوێت، چونکە کامەرانی ناناسێت ئەوتەنها قازانجی ساتەکانی خۆی لەبەر چاو گرتووە، کارەکەی نابەدڵەو نەفرەتی لێنەکات کەسانی وەك ئەم کارمەندە بە زۆری فەناو لە ناوبردنی خۆیان هەوڵ ئەدەنو ناگەنە جێگەی مەبەست، چونکە ڕێگەکەیان لەبەر نەگرتووە پێش گەیشتن بە هێڵی کۆتای باشتر وایە بە دڵسۆزی خۆشەویستییەوە لەگەڵ خۆماندا بدوێین و بزانین بەم شێوەیە چ ئەنجامێکمان دەستگیر ئەبێت.

با وای دانێین بە هۆی دڵسۆزی بۆ کارەکەمانەوە لە خزمەتی خەڵکیداین بە هەڵەدا نەچیت.. مەبەستم ئەوە نییە بەهۆی کارەوە توشی پیاهەڵدانو ماستاو کردن ببین نەء.. بە هۆی خۆشەویستییەوە بۆکارەکەی خۆمان و بەدڵسۆزیەوە ڕاپەڕاندنی دەبنە هۆی خزمەتی خەڵکی کەمتر توشی چاوەڕوانی بێ هودەیی ئەبین، لە کۆتای مانگیشدا هەست بەو ئاسودەییە ئەکەین کە بەو ویژدانەوە بەرامبەرەکەی دێتە دەستمان نەك کلاومان لەسەر کەسانی دیکە نابێت .

## ڕێسای پێنجەم :

هاوڕێیەتی لەگەڵ كەسانی بزێوو بە جۆشدا بگرە

(ئیمرسۆن) فەیلەسوفی ئەمریكی ئەڵێت :

" من بە دۆستایەتی كەسێك نیاز مەندم كە هانم بدات تا هەرچییەك لە ئەستۆمدایە بە ئەنجامی بگەیەنم .."

بە پێناسەیەكی تر :

(ئیمیرسۆن) ئەڵێت : پێویستم بە هاوڕێیەتی كەسێكە هاندەرم بێت بۆ لێوەشاوەیی خودی خۆم و بزانم چیم لە بارەدایە.

خانمی خۆشەویست :

تۆ ئەتوانیت گرنگی زیاتر بدەیت بەو كەسانەی ورووژێنەری مێردەكەتن و شایانی ئەزمونو چالاكی بەخشن بەمێردەكەت

ئەگەر ئەتەوێ تیشكی چالاكی و زرنگی لەدڵ و دەرونی مێردەكەتدا بدرەوشێتەوە پێویستەهانی بدەیت بكەوێتە ژێركاریگەری كەسانی هۆشمەندو زرنگ و مانای تەواوی ژیان بزانن بەبەهای مرۆڤایەتی خۆیان ئاشنا بن.

كاتێكیش هەستان بەئاشنایی و هاوشینی مێردەكەتان كرد لەگەڵ ئەو جۆرە كەسە هۆ شیارو زرنگ و چالاكانە ئەو كات بۆتان دەرئەكەوێ كە بیرو بۆچونی مێردەكەتان سەبارەت بە كارو كرداری ژیان چەند گۆڕاوە

یەكێكی دیكە لە ئەركەكانی ئێوە ئەوەیە كە مێردەكەتان هەستی ئەوە ئەكات كە ئێوە دەركتان بەوە كردوە مێردەكەتان لە كەسانی دیكە كەمترە ئەتەوێ بەم ڕێگەیە كەمو كوڕیەكانی بۆ پڕبكەیتەوە .

## ڕێسای شەشەم :

خۆت ناچار بکە کە چالاك بیت  تاکو بە ڕاستی بزێو وچالاك نەبیت
ئەگەر ئەتەوێ ورروژاندن سەراپات داپۆشێت ئەوا خۆت دەرخە، خۆ دەر خستن
ئەبێتە مایەی ورو ژاندن.
ئەگەر ئەتەوێت بەد بەخت و بێچارە بیت و هەست بە زەبونی بکەیت ئەوا بە
بەدبەختی و زوەبونییەوە خۆت دەربخە تاکو زەبون ئەکەویتە پێش چاو.
سەرنجێك لە وتەی پرۆفسۆر (جیمز) بدە کە ئەڵێت :

خوگرتن بە خۆ ورروژاندن دەبێتە هۆی ورروژاندنی ڕاستەقینەو گەیشتن بە
مەبەست.

گەر بڕوایشت بە وتەی پرۆفیسۆر جیمز نییە .. ئەو ڕۆژەی ڕۆژی پشودانە
و مەبەستت نییە بۆ کارێك بچیتە دەرەوە ..

## ٥ .. فێری گوێ گرتن ببە ..
## فێری ئەوەببە بە دڵ گوێ بگریت ..

مانگی دیسمبری ساڵی ١٩٥٠ پیاوێك بە ناوی (بیل جونز) خۆی گەیاندە سەربانی تەلارێکی پێنج نهۆمی لەشیکاغۆ، بیل جونز مەست و حەیران تەماشای ئەملاو لای خۆی ئەکرد،لە خۆی ئەپرسی بۆچی خۆی گەیاندۆتە ئەم سەربانە بەرزە خۆیشی نەینەزانی بۆچی ..؟

بەلام، ڕاستیەکەی ئەوە بوو کە وەگەڕ خەری بناغەیی ئەو گەیاندیە ئەو سەربانە بەرزە هیچ نەبوو جگە لە ترس و بیم و غەم و پەژارە نەبێت.

چونکە ئەو بازرگانێکی زەردر مەند بوو، سەردەمێك بوو دەرامەتێکی چاکی لە ژێر دەستدا بوو، بەلام گەردشی ڕۆژگار بە چۆکیدا هێنا بوو، لە ناچاریدا بۆ بژاردنەوەی قەرزەکانی ڕووی لە بانك کردبوو بڕە پارەیەکی چاکی لێ ڕاکێشا بوو، بەلام لێرەشدا ئەو قەرزەش دادی نەدابوو، لە هەمویشی خراپتر ئەوە بوو نەینەتوانی ئەو بەد بەختی و کارەساتانە بۆ ژنەکەی باس بکات.

(بیل جونز) بە بیرو هۆشێکی تاریکەوە ئەیڕوانیە ژیان و دنیای لەبەر چاو بوبو بە کونی دەرزی، ئێستا لە دواین نهۆمی تەلاری گەورەی شیکا غۆ دایەو گەیشتۆتە هێلی کۆتایی هیچ تروسکاییەکی ئومێد شك نابات.

بیری لەو ڕۆژگارە ئەکردەوە کە هەموو شتێك مل کەچ بوون .. بەلام ئێستا چی ..؟ بۆ ئەو ئەمە کۆتا ترین هێڵ بوو.

ژیان شیرینە، بەڵام ئەو شیرینیە ناتوانێت دەمامك بکێشێت بەسەر بەچۆکدا هاتن و نابڕو چون، خەیاڵی دەرباز بوون لەدەست ئەم هەموو غەم و پەژارەیەئەوی گەیاندە لێوی ئەو بازنە بەرزە، خۆخستنە خوارەوە ..! کێشران بە زەوی ڕەقو تەقدا مل ملانێی مەرگ، ئەمانەی لە خولەکێکدا ڕوئەدەن ئیدی کۆتایی بە هەموو شتێك دێت، دەنگێك خۆی کرد بە دەرونیدا و پێی ووت :

- بیل، دەسبەکار بەو تەواو تەواوی کە ..!

کاتێ بە خۆی زانی لە هەوادایە پێشکەوتنە خوارەوەکەی چرکە ساتێکی دودڵی هات بە خەیاڵیدا، بەڵام تازە کار لە کار ترازاوە، کار لە کۆتاییدایە..

بیل چەند جوڵەیەکی نائومێدانە و پلە قاژەیەکی [illegible] کرد و لە بەرچاوی خەڵکی ڕێبواران و سەر سوڕماودا، کاتێکیان زانی کەوتە بەر پێیان سەر سوڕهێنەرە ..! هەموو ڕێبواران کە دەوریان لێدا بوو گوێیان لێ بوو، بە خۆی ئەوت : ئەبێت هەر بمرم .. بۆ مردن باشم .. ..!

بەڵام ئەو خەڵکە بۆ گەیاندنە نەخۆشخانە پەلەیان نەکرد و ئەویان لەو هەڵە گەورەیە وەدەرنا بەڕاستی سەیرە ..کەوتنە خوارەوە لە تەلارێکی پێنج نهۆمی و بینەوەی تۆزقاڵێك ئازاری پێبگات.

لە نەخۆشخانە پاش خستنە ژێرچاودێری وردەوە دەرکەوت گەورەترین ئازارو زەبرێك لەئەندامانی بەرێزجونز کەوتبێ تەنها شکاندنی نینۆکی پەنجەی دەستی ڕاستی بووە ..

ئەو تەنها کاتژمێرێك زیاتر لەنەخۆشخانەدانەمایەوە ،کاتێ ویستی نەخۆشخانە بەجێ بێڵێ ئیدی ئەو غەمو پەژارەیەی کەدڵو دەرونی

داپۆشیبوو بو بووە مایەی خۆکوژییەکی دەسبەجێ فەرامۆشی کردن بیری لەمۆعجیزەیەك کردەوە و ئنجا بەخۆی گووت :

- باشە، خوانەخواستە خۆ ئەگەر بمردمایە، دنیا وەکو خۆی ئەمایەوە هیچ گۆڕانکاریەك ڕوینەئەدا.

جۆنز ..کاتژمێرێك لەمەوبەر لەوپەڕی ڕەشبینیدا خۆی ئەبینییەوە، ەرگەگرتنی دژواریەکانی بەلایەوە کارێکی مەحاڵ بوو، کەچی ئێستا گۆڕانکاری تێدا هاتۆتە دی و بڕیار ئەدا زیندو بمێنێتەوەو بژی...هەرکە لە ەخۆشخانە وە دەرکەوت بەرەو ماڵ چوو، هەموو شتێکی بۆ ژنەکەی گێڕایەوە هەر لە سەرەتای زیانەکانیەوە پیادا هات هەتا کارەساتی خۆکوژیەکەی.

خانم جۆنز ..

هێندە بە سەرسامیەوە گوێی بۆ قسەکانی شل کردبوو هەر ئەتوت پەیکەرێکی بێگیانە خانم پاش ئەم سەر سامیە زۆر بە داخ و حەسرەتەوە ووتی :

- بیل تۆ ئەم هەموو غەم و پەژارەیەت چەشتوە بێ ئەوەی هیچ شتێك بۆ من بدرکێنی ..؟

جونز بە ڕوخسارێکی شەرمەزاری و لێبووردنەوە بە دەنگێکی ئێکجار نزم لەسەر خۆ ووتی :

ترسی ئەوەم هەبوو بکەومە بەر تانەو تەشەری تۆ و تۆ وابزانی من مرۆڤێکی گێل و نەفامم..!

(خانم جونز) لەوەی تا ئەو کاتە مێردەکەی ڕازی زیانەکانی پەنهان کردبوو بێزار بوو، بەڵام بە خۆیدا هاتەوەو بیری کەوتە بیری ئەوەی کە ئەبێت

شانبداتە ژێر ئەمبارە سەنگینەی مێردەکەی و نەهێڵێت ئەو هەست بە تەنهایی بکات لە پێگیری ئەم ئەندێشانەدا خانم (جونز) بە مێردەکەی ووت:

- بیل ...لەم ساتە بە دواوە ئیدی تۆ تەنها نیت و ئەگەر گیرو گرفتێك بێتە پێش منیش پەیوەندی دارم پێوەی .

ئێمە لە یەکدی جودا نین و لەبەر گرفتێکی ماڵی بێ بایەخ لە یەکدی جودا نابینەوە، پێویستە ڕێگە چارەشی بۆ بدۆزینەوە

جونز پاش چەند مانگێك پەژارەو بێ حەوسەڵەیی، ئیستاکە هاوبەشی خەمەکانی بۆ پەیدا بووە و وردە وردە توانی پشو بە دەمارە گرژەکانی بدات و پاش چەند ڕۆژێك پشودان ئەمجارە ورەو تواناکەی بویە دوو بەرامبەر .

(جونز) ئێستا نەك هەر لە نیگەرانی و سەرزەنشتکردنی ژنەکەی خەمی نییە، بەڵکو یاوەرو هاوڕێیەکی هەیە کە ئەتوانێت نیوە باری کێشەو گرفتەکانی لەگەڵ بدات بەکۆڵدا .

ئەمڕۆ (جونز )جارێکی دیکە بەخت یاوەریەتی، گلۆلە کەوتۆتەوە دەست خۆی و نە قەرزاری کەسەو نەبەڵێن نامەی ناتەواویشی هەیە، لە هەموشی گرنگتر ئەوەیە بۆی دەرکەوتوە پیاوبۆ سەرکەوتن و چارەی کێشەکانی پێویستە هاوشانی خێزانەکەی بێت و باوەڕی تەواوی بەداب و نەریتی ڕۆژهەڵات هەیە، واتە خێزانەکەی لەخۆشی و کامەرانی ناخۆشی و ناکامی و گرفتاریدا بەهاوتاو هاوشانی خۆی ئەزانێ، ئەو بڕوای بەوە هەیە لەتەواوی مل ملانێکانی ژیاندا ژن و مێرد پێکەوە هاوشان و یەکسانن ...

بەسەرهاتی "بیل جۆنز" کە بەسەر هاتێکی دورلە خەیاڵو ڕاستەقینەیە ئەم بانگەشەیە ئەسەلمێنێ کە ئەگەر.. پیاوێك بڕوای تەواوی بەژنەکەی نەبێت و رازو نیازە نهێنیەکانی لێبشارێتەوە ئەوکات لەشکست

وبەچۆکدا هاتنەکانیدا نابێت ژنەکەی بەختەبار بزانێت چونکە، خۆی بەتاقی تەنیایە و حەوسەڵەو تاقەتی تاقەکەسێکیش ئێکجار کورت و کەمە ...

(هەندێ لە پیاوان سەرکەشییەکی سەیریان هەیە، کێشەو گرفتەکانیان لە هاوسەرەکانیان ئەشارنەوە و پێیان وایە پیاو تەنها ئەبێ ماڵ و سەروەت و سامان و پارەو ئاڵتون بەرێتەوە بۆ ماڵ تاکو بێتە مایەی ڕێزو شکۆمەندی، خۆ ئەگەر بێت و خوانەکردە ژنەکەی پێ بزانێ کابرای مێردی قەرزارە ئەوە ئیدی لە ڕێزی پیاوەکەی کەم ئەکاتەوە واتە بە چاوی سوك و بێ ڕێز تەماشای ئەکات) .

لێرەدا ئەگەر ژن بە ڕاستی تێگەشتو بێت ئەتوانێ ڕۆڵی باڵا لە ئەخشەو پلانی ئایندەی خۆیو خێزانەکەیدا ببینێت دەستی یارمەتی و ڕێگە چارەی کێشەکان واڵا بکات بەڵام، بە پێچەوانەوە یەکێك لەو دەردە کوشندانە کە بەربەستە لەبەردەم کێشەکانی پیاوداو هانی ئەدا کە سفرەو خوانی دڵی خۆی لە بەردەمی ژندا واڵا ئەکات ئەوەیە ژن بە گوێی دڵ و دیقەت و سەرنجەوە گوێ بیستی کێشەو قسەکانی پیاو نابێت، لە هەلومەرجێکی لەمجۆرەش پیاو ترسی ئەوەی لە دڵدایە بێتە گاڵتەجاڕی دەستی ژنەکەی هەربۆیە بە بیر لێکردنەوەی زەندەقی دەچێت..!

جا بۆیە باش گوێگرتن و گوێ شلکردن بۆ ووتەکانی مێرد کارێکی ئێکجار گرنگە.

لە پایزی ١٩٥١دا گۆڤاری (فورچون) دەرەنجامەکانی هەندێك لێکۆڵەرو توێژەری هەندێك دەروونناس و تایبەتمەندی بوارە کۆمەڵایەتی و خێزانییەکانی بە چاپ گەیاند لە ڕاپۆرتێکی بڵاو کراوەی (فورچون)و لە زاری سەرۆکی دەستەی دەروونناسانەوە هاتوە :

یەکێك لە کارە هەرە گرنگەکانی ژن کە بتوانێت بۆ پیاوی ئەنجام بدات ئەوەیە بوار بڕەخسێنێ بۆ مێردەکەی تاکو بتوانێ دەردی دڵی تیا هەڵڕژێت ئەو کێشەو

گرفتانەی دێتە ڕێگەی و ناتوانێ بۆ کەسانی دیکەی باس بکات و بیدرکێنێت بۆ ئەوی باس بکات

دیارە ئەو ژنانەی ئەم ئەرکە ئەگرنە ئەستۆ و کاری پێوەکەن ئەبنە هۆی هاوسەنگی بەهێز کردنی هەستی هاوڕێی دەرونی لە پیاودا خۆ شبەختی و کامەرانی خۆشبەختی بەرجەستە ئەکەن.

لە کۆبەندی بەرەنجامی لێکۆڵینەوەکاندا هاتوو:

" پیاو ئەوەندەی پێویستی بە ژنێکی گوێگری بە هۆش و زرنگە .. هێندە پێویستی بە ژنێکی مامۆستای بێ گوێی نیە ..! "

ئەو ژنانەی خۆیان کارو پیشەیەك ئەنجام ئەدەن ئەزانن بەرەنجامی کاری چاك و خراپ چ کاردانەوەیەکی هەیە

.. ژنێکی گوێ ڕایەڵ بتوانێ تەسەلاو ئۆخژن بە دڵی مێردەکەی ببەخشێت لە نێو خەڵکی و کۆمەڵیشدا خۆشەویست و جێگەی ڕێزە ..

ژنێك بە ویقارو ئەدەبەوە لە بەرامبەر قسەکەرێکدا گوێ ڕایەڵی خۆی نیشان بدات بە دەربڕینی پرسیار گەلێکی گونجاو سەرنجی بەلای خۆدا ڕاکێشێت ، ئەوە ژنێکە نەك هەرتەنها جێگەی پرس و ڕاوێژی مێردەکەیەتی بەڵکو مایەی خۆشەویستی هەمو ژنانی دیکەشە .

"داك دومورنی"نوسەری ناسراوو بەتوانا ئەڵێت :-

پیاوی بەئەدەب ئەو پیاوەیە بەتەواوی تامەزرۆییەوە گوێبیستی باسێك بێت لەکەسێك هەرچەندە خۆیشی لەوەو بەر تەواوی ئەوباسەی بیستبێت ..!

ئەو خانمانەی خوازیارن تەواوی خۆشەویستی کۆمەڵگە قۆرخ بکەن پێویستە ئەم یاسای کارکردنە ( دستور العمل)ە لەبەر چاو بگرن بیر تیژی ژنانەی خۆیانی تێدا بخەنەگەڕ .

خانم"میرنالوی"پێش ئەوەی لە کۆنگرە سیاسییەکاندا چالاکیە سیاسییەکان بە ئەنجام بگەیەنێ، پێشتر سەرگەرمی کاری هونەر پیشەیی بوو، ئەو لە ڕیپۆرتاژێکدا لە ڕۆژنامەی (هرالد تربیون )دا ئەڵێت :-

کاتێك ڕێکخەری کاروباری نوێنەرایەتیەکانی ئەمریکا بووم لە کۆمیسیۆنی فەرهەنگی، هونەری و زانستییەکاندا بەشداریم ئەکرد هەمیشە ئەو مەشخەڵەم لەپێش چاوی خۆم دانا بوو ..گوێگرتن ..فێر بوون، گوێگرتن لەنوێنەرانی وڵاتە جۆراو جۆرەکان ، ئاستی زانیارییەکانی بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەرز کردەوە . هەرلەدوای ئەوەش بوو ئەتوانم بڵێم زیاتر دەرکم بەگیرو گرفتەکان ئەکرد .

هەڵبەت جاری وایش هەیە لەگوێگرتن مرۆڤ ماندوو ئەبێت ، ئەم حاڵەتە بەسەر منیشدا هاتووە ، بەڵام بەڕای من باشترە مرۆڤ بەزرنگی هوشمەندییەوە گوێبگرێت تا ئەوەی سەر ئێشە توشی خۆ بکات.

**گوێگری باش پێویستە ڕەچاوی سێ شت بکات ..**

یەکەم : کاتی گوێگرتن، چاوەکان، لە ڕوخسارو تەواوی بەدەن سود وەربگرە نەك بەتەنها لە گوێچکەکان ..

سەرنج دان واتە : قوڵبونەوەو ڕۆچوونی تەواو و پڕوا پڕی بیروهۆش خودی خۆت کاتێ باسی ڕوداوێك بۆکەسێ ئەگێڕیتەوە، ئەگەر بەرامبەرەکەت تەماشای شوێنی تر بکات بەسەری پەنجەکانی یاری لەسەر مێزەکەی بکات وەها پاڵی لێدا بێتەوە کەمەیدانێك لێت دورە

ئایا هەست بەوە ناکەیت بایەخێکی ئەوتۆی بە قسەکانی تۆنەداو ..؟

ئەگەر بمانەوێت بە جوانی گوێ لە کەسێك بگرین پێویستە بە وردی چاو ببڕینە چاوی تەنانەت کەمێك سەرمان بۆلای ئەو نزیك بکەینەوە گوێ شل بکەین بۆ

وتەکانی ئەوجا ڕوخسارمان والێبکەین کەبەتەواودتی ماناوە دلۆ دەروغان لەلای ئەوە و خەیاڵمان بەلای هیچ لایەکدا نەڕۆشتووە.

خانم "مارگری ویلسن" لە فێرکردنی هونەری سەرنج ڕاکێشاندا تایبەتەندی تەواوی هەیە ئەڵێت :

گوێڕایەڵی کەسانێك بن ئەتوانن باسەکەیان بەکەڵکو لۆژێکیانە بێتو کاتێکیش پرسیارێکتان لەسەر بابەتەکەی هەیە بەگۆڕینی سیمایەك یاخود جوڵەیەکی دانیشتن حاڵی بکەن ئێمەش گەر بمانەوێ گوێگرێکی باشبین، پێویستە خۆمان واڕابێنین لە بەرامبەر ئەو کەسەی باسێکمان بۆ ئەکات هەموو ئەندامەکانی لەشمانی بۆ بکەینە گوێ ..

ئایا تاکو ئێستا سەرنجی ئەو پشیلەیەتداوە بۆسەی بۆ مشکێك داناوە هەموو گیانی لە حاڵی ئامادە باشیدایە تاکو ڕاوی بکات ..؟

کەواتە گوێگرێکی باش ئەبیت هەر وەك ئەو پشیلەیە چاوەڕوانی ڕاوی وشەو پەیڤەکان بێت

دووەم : هەوڵی ئەوە بدە کۆمەڵە پرسیارێك ڕێکبخەیت هاوڕێکی فیکرو بیرو ڕای خۆتان بێت ..

دیارە لێرەدا ئەپرسیت پرسیارێك هاوڕێك بێت لەگەڵ بیرو ڕادا مانای چی ..؟ هەقی خۆتە ..

بۆ ڕونکردنەوەی ئەم مەبەستە سەرەتا مۆڵەتێك ئەخوازم سەبارەت بەو هەواڵ و گوزارشانەی لە ڕادیۆو تەلەفیزیۆنەوە پەخش ئەکرێن ئاماژە بە خاڵێك بکەم ..کاتێك لە کەناڵەکانەوە پرسیار گەلێك دێتە ئاراوە کە خۆیی و دور لە حاڵەتی فەرمانی و دەستوری بێت، بە گفتوگۆی گوێگریش بوارێك ئەدەن لەسەر خۆو بە هێمنی وەڵامێك بداتەوە، بەڵام گفتگۆی گوێگر لەناستی پرسیارە قورس و

دەستوریەکان ناچاری ئەکات وەڵامی فەرمانی و دەستوری بداتەوە پرس و جۆکەش لێرەدا کاڵ و کرچە، ئەم ڕونکردنەوەیەش ئەتوانێت ئەنجامێك بەدەستەوە بدات کە پرسیاری دەستوری زۆرینەی جار زبرەو نەرمو نیانی تێدا بەدیناکرێت، لەوانەشە بێتە هۆی بێزاری و قسە پێبڕینی قسەکەر .

پرسیار کەر ئەبێت بەزرنگی و لێزانی خۆی لەپرسیارەکەیدا بگونجێنێ، کەسێکیش بیەوێت بێتە گوێگرێکی باش پێویستە پرسیارەکەی بەجێ و گونجاوو بەنەدەبانە بێت .

کەواتە گوێڕادێران لەدەردی دڵ و قسەکانی مێرد، بەبێ ئەوەی خۆتێ هەڵقورتاندن و پۆز لێدانی تێدا بێت جۆرێکە لەو ئاکارەی دەبێتە هۆی شیرین بوونی ژن ، ئەگەریش ویستی پێشنیارێك یان بۆچونێکی هەبێت ئەوا پێویستە بەم شێوەیە دەریببڕێت ،

ئەزیزم پێت وانەبێ تەنها بتوانی لەڕێگەی ئاگاداری و ڕیکلامەوە بتوانی زەمینەی مامەڵەی کڕین و فرۆش فراوان بکەیت یان پێت وانەبێت ئەم کارە زیانێکمان پێ ئەگەیەنێت .

پرسیار کردن :-

پەندو ئامۆژگاری نییە ، بەڵام پرسیارێك بەزرنگی و وریاییەوە دەربڕڕێت هێندەی پەندو ئامۆژگارییەك دەرەنجامی ئەبێت .

بۆ بەزاندنی شورای ئەوبێدەنگییە لە کۆڕێکدا یان لە دانیشتنێکدا، یان کاتێ ڕوبەڕوی کەسێکی نەناسراو ئەبینەوە پرسیاری بەجێ و گونجاو گرنگترین فاکتەری دەرباز بونە لە چنگ ئەو شەرمەزاری و کەم ڕوییە و ئەبێتە هۆی گەرمو گوڕیو ئاسودەیی ئەو کۆڕە.

سێیەم:-

هەرگیز هەوڵی ئەوە مەدەن خیانەت لە نهێنییە سپێردراوەكانی مێردەكەتان بكەن وریای ئەو بڕوایە بن كە پێتان بە خشراوەو بە هەدەری مەدەن. یەكێكی دیكە لەو ئەخۆشیانەی دوچاری پیاو ئەبێت بە گفتوگۆو ڕاوێژ نەكردن لەگەڵ ژنەكەیدا، ئەوەیە :- بڕوای تەواوی بە ڕازداری ژنەكەی خۆی نییە، ئەوجا ترسی ئەوەی هەیە هەرچی ڕازو نهێنییەكی بخاتە ژێر چنگ، سبەینی لای هاوڕێكانی وتەنانەت لە نارایشتگاكاندا تۆز ئەكات، هەربۆیە لە لایان شتێكی بەڵگەنەویستە هەرچییەك بەس تەنها بگاتە گوێی ئەوان دەمو دەست ڕەها ئەبێت .. وەك وتراوە (..... بێ و دەم ڕەشەبا بكەوێت ) .

مێردەكەی خاتو" الیزابیت" بڕیارە بێتە سەرۆكی بانك .... دیارە هێشتا نەبووە، هەر ئەوەندە خانم ئەم هەواڵەی وەبەر گوێ كەوت .. ئیدی لە هەمو لایەكەوە پەخش بوو دەنگی دایەوە ... بۆ..؟

چونكە، خانم لەگەڵ هاوڕێكانیدا چاو لێكەرییەكی بەرفراوانی هەیە دەیەوێت بەم شێوەیە ئەویش چاولێكەرییەكانی دەربخات هەربۆیە خوازیارە بە تەلەفۆن پیرۆزبایی لێبكەن، پاش ئەم بێنەو بەردەیە هەواڵ دەگاتەوە دەم مێردەكەی، بەدبەختە خۆیشی نازانێ كەی و چۆن ئەم هەواڵە بە گەواڵەیە كراوە .

لەدیدارێكی بەڕێوەبەری گشتی كۆمپانیایەكی گەورەی بازرگانیدا ، ئەو پیاوە بەئەزمونە پێی ووتم :-

ئەو هەمیشە ئەوە بۆ كارمەندەكانی دوپات ئەكاتەوە كاتێ ئەچنەوە بۆ ماڵەوە بەهیچ جۆرێ سەبارەت بەكارو باری كۆمپانیا گفتو گۆ لەگەڵ ژنەكانیاندا نەكەن ، ئەو جەختی لەسەر ئەوە كردەوە *(ژنانی زۆر بڵێ‌وچەنە باز توانای شاردنەوەی نهێنی و ڕازداریان نییە )* من لێرەدانامەوێ بیرو ڕای ئەو بەڕێوەبەرە زیاتر ڕون بكەمەوەوداكۆی لەژنان بكەم چونكە زۆرجاریش ڕێدەكەوێت

هەموو ڕێیەك بۆ هەموو جێیەك ناچێت بەواتا هەموو بۆ چونێك دەقاو دەق ڕاست و دروست نییە، بەڵام ژنگەلێك ئەناسم، بێگومان ئێوەش دەیانناسن، هیوا خوازم لەو جۆرە دەستەیە نەبن، کاتێ کێیەك کێبەر کێیەك یان جیاوازیەك لە نێواندا ڕو نەدات ئەم دێت و ئەو ڕازو نهێنیە شاراوانەی کە لە ژێر چنگیدایە ڕاست و ڕێك ئەکێشێتە تەختی نێو چەوانی و دەیکاتە جەخت و پێداگری و هەڕەشە لێکردن و شەرمەزار کردنی ..

لەم گێرەو کێشەیەی خودی خۆم شاهێدی حاڵ بووم ئەم وشانە لە دەمی خانمەوە ڕەها ئەبون.

- خۆت بە منت ووت کەلوپەلو ناو ماڵەکەی فلان کەس ... چەند بە هەرزان و مفت دەستت کەوت و بەتاڵان کڕیت، ئێستا بە من ئەڵێیت: جلی گرانبەها نەکڕم و پارە بە فیڕۆ نەدەم

ئەو کەسانەی لەبارەی کەل ڕ پەلی ناو ماڵەوە بە هەرزان و پارە دەست کەوتنی مێردەکەی لە بەر چاوی کەسانی دیکەدا بەتەواوی کابرای شەرمەزار کرد .

پاش ماوەیەك لە هەمان خانم پرسییەوە کە گلەیی لە مێردەکەی نەکرد گوایە هیچ شتێکی پێ ناڵێت لە بارەی مامەڵەکانییەوە

کاتی هۆکەیم لە مێردەکەی پرسی : زۆر بە نارامیەوە ووتی : ئیدی نامەوێت بە دەستی خۆم چەقۆ بدەمە دەستی تاکو بە نارەزوی خۆی قەسابیم تیابکات.

بۆ ئەوەی کە ژن، گوێڕایەڵێکی چاك و خاوەن دەرکێکی باش بێت، دیارە هێندە پێویست ناکات لە هەمو کارێکی مێردەکەیدا خۆی بکاتە کەوچکی ناو کاسە .

بۆنمونە : ئەگەر پیاوەکە ئەندازیارێك بێت پێویست ناکات بەرەو ئەو کارانەی لە سنوری ئەو دا نین خۆی ماندوو بکات و پێداگیری لەسەر زانینی بکات. بێگومان کاتێ پیاو هەستی تەواوی بە دڵنیایی و ڕاز داری ژنەکەی کرد بەتەواوی ئارەزو بکات لەبەر دەستیدایە یەکێك لە هاوڕێکانم کە پیشەکەی تایبەتمەندیە لە بواری ژمێریاریدا لە پاش زەماوەند سەبارەت بە ژنەکەی ئەڵێت :

لەوەتەی بوینەتە هاوسەر بەڕاستی زۆر دڵخۆشم و کاتێك لەسەر کار بەرەو ماڵەوە ئەچمەوە،وردترین و ئاڵۆز ترین مەسەلەی لەگەڵدا باس ئەکەم، ئەویش بە دیقەت و سەرنجێکی سەرسوڕهێنەرەوە گوێ بیستی قسەکانم ئەبێت بەڕاستی لەم گوێ گرتنەش من تام و چێژێکی زۆر ئەبینم .

خانمە بەڕێزەکان : سەرنج بدەن ..لەهەستەوەرێکی ئامادە بۆ بیستن لە نزیك مێردەکانتانەوە لە سیمایەکی ڕازاوە جوانترە .

لێرەدا ئەو سێ خاڵەی ئەبێت ڕەچاو بکرێت دوپاتی ئەکەمەوە

١. سەرنجی خۆت بۆ گوێ گرتن لە سیماو ڕوخساردا دەربخە .
٢. فێری پرسیاری بەجێو گونجاو ببە.
٣. هەرگیز خیانەت لە نهێنیەکانی مێردەکەت مەکەو ئەو بیرو ڕایەی پێی بەخشیویت لەدەستی مەدە .

## خانم ..! تۆ لەگەڵ دوو کەسێتیدا هاوسەریت کردووە ..!

(لردچستر فیلد ) سیاسەتمەدارو ناوداری ئینگلیزی ئاماژەی بە ڕاستییەك کردووە کە لە پیاودا هەیەو گرنگی تەواوی بۆ ژنان هەیە ئەو ئەڵێت :

" لە ڕاستیدا هەر پیاوێك دوو کەسە،کەسێتیەك لە حاڵەتی ئێستادایە و کەسێتیەکی دیکە کە دەیەوێت ببێت .."

پیاوێکی شەرمن و کەم ڕوو دەیەوێت گوستاخ و ڕودار بێت،ئەگەر خۆشەویست نەبێت هەوڵی ئەوە ئەدات خۆشەویست بێت، تاوەکو هەمووخەڵکی ئەویان پێپەسەند بێت و خۆشیان بوێت،ئەگەریش بڕوای بە خۆی نەبێت نەیەوێت خۆی بکاتە کەسێکی بە تواناو وزە .

ئەرکی ژنی هۆشیارو زیرەك ئەوەیە،هانی مێردەکەی بدات ئەو کەسێتیەی مێردەکەی خوازیاریەتی بە دەستی بێنێت، دیارە نەك بە ڕێگەی ناخۆشی و نازاردان خانم .ئاگاداربە هیچ کات مێردەکەت بە مێردی ژنی دراوسێکەت بەراورد مەکە باشترین ڕێگەش بۆ هاوکاری کردنی، وروژاندن و هاندانە ئەبنە هۆی بەهێز کردنی حاڵەتی دەرونی ئەو خانم (مارگری همنر)نوسیویەتی :

کەمترین پیاوانێك هەن کە هاندان و وروژاندنی ژن کاریان تێنەکات،کاتێك بە مێردەکەی ئەڵێت :

☜ تۆ کەسێکی بێ وێنەیت، تۆ پیاوێکی زۆر چاکیت، من بە هەبوونی مێردێکی وەك تۆوە شانازی ئەکەم خۆشبەخت و کامەرانم مێردی منیت ..! هەر ئەم پیاهەڵدان و باسکردنە کورتە ئەبنە هۆی وروژاندن و بەهێز کردنی دەرونی ئەو و خاوەنداریەتی ئەو کەسێتیەی خوازیاریەتی دێتە دی. هەر بۆ سەلماندنی ئەم بانگەشەیەش

بەڕێز : پارکز .. خاوەن کۆمپانیای بەرهەم هێنانی پارچە پێویستیە یەدەکیەکانی ئوتومبێلە گەورە بارهەڵگرەکان کە دانیشتوی شاری (تنسی)یە بۆی نوسیوم :
من بۆم دەرکەوتوە پیاو نەك هەر تەنها نەتوانێت بەدەستهێنەری ئەو کەسێتییە بێت کە خوازیاریەتی، بەڵکو ئەتوانێت ئەو کەسێتیەشی ژنەکەی خوازیاریەتی بەدەستی بێنێت.
بەڕێز : (پارکز)

لە درێژەی نامەکەیدا کە لە ڕاستیدا بانگەشەیەکە ئەڵێت :
من تاکو ئێستا کارمەندانێکی فرەم خستۆتە سەر کار،بەڵام بە هیچ یەکێك لەوانە پۆستێکی گرنگم نەسپاردووە، تاکو پێشتر گفتو گۆم لەگەڵ ژنەکەیدا نەکردبێت، وتەو گفتوگۆ و وەڵامەکانی ئەو ژنانە بەلای منەوە تاکە جوغزی دیدگاو چارەنوسی مێردەکانیانە.
دیارە لەلاتان ئەو پرسیارە قوت ئەبێتەوە چۆن بۆ نەخشەسازی کاری ئەو پیاوانە پەنام بردۆتە بەر دیدو بۆچونی ژنەکانیان ..؟
لەجیاتی هەر وەڵامێك لە ژیانی ژن و مێردایەتی خودی خۆم و ژنەکەم سەرنجی خۆم و ژنەکەم بدەن :
ژنەکەم بەر لە شوکردنی بە من خاوەنی هەموو شتێك بوو، خاوەنی دایك و باوکێکی سەرمایەدارو دەوڵەمەندو بڕوانامەی بەرز ماڵو ژیانی ئابڕومەند وجوان و ڕازاوە، من نەمایەو نەسەرمایە نەدارو هەژار ساڵەکانی سەرەتای هاوسەرێتیمان بە ناکامی و بەزیوی لە ململانێدا بووم، تاکە هاندەرو وەگەڕ خەری هەمیشەییم ئەو بوو ئەیهەژاندم ..

هەر سەرکەوتنێکم وەدەست هێنابێت بێگومان قەرزاری ئارامش و توانای ئەون، تەنانەت لەو ساڵانەی دواییدا دوچاری نەخۆشیەك بوو هەرگیز ڕوی

گەش و سیمای خەندانی خۆی لە دەست نەنەدا، سەرباری ئەو دەرد ناکیەش هەر لە هەولو کۆششی کۆمەك کردنی مندا کەم تەرخەمی نەکردووە هەموو سەر لە بەیانیەك پێش لە ماڵ دەرچوونم پێم ئەڵێت :

☜ ئایا ئەمڕۆ کارێکت هەیە بۆت ئەنجام بدەم ..؟کاتێکیش ئەگەڕێمەوە بۆ ماڵ بە دیقەتێکە تەواوەوە بە گوزارشی ڕۆژانەم گوێڕایەڵ ئەبێت ..ئەو هەلو مەرجێکی ئەو تۆم بۆئەڕەخسێنێ کە بتوانم سەرکەوتنی باڵاتری پێ بەدەست بێنم لە کانگای دڵمەوە لە خودا ئەخوازم ئەوم بۆ بهێڵێت ..

بەدبەختانە هەندێك لە ژنان بە پێچەوانەی خانم ((پارکز)ەوە ڕەفتار ئەکەن و مێردەکانیان لە خواست و ئارەزوەکانیان ئەکەن، دەبنە هۆی ڕەشبینی و وایان لێئەکەن بەتەواوی دەستیان لە ئومێدەکانیان بشۆن.

مادام ژن خوازیاری ئەوەیە پێی وایە گوێ دراوە بە داواکاریەکانی و پیاویش لەبەر ئەوەی گوێ نەدراوەتە داواکاریەکانی ئەو بەدوای بیانویەکدا ئەگەڕێت کە بەرپەرچی پێبداتەوە، بەڵام ئەو چونکە ماڵی ڕازاوەو ئوتومبێلی دواین مۆدێل پۆشاکی گرانبەهاو، سەفەر کردن و میوان و سەردانی ئەوێت ، لێرەدا مێردیش کە خوازیاری ئارامی و فرەسەتی موتاڵا کردنە ، لەبەرامبەر داواکارییەکانی خانمدا ناچارە کارێکی وا بکات تا بتوانێ خواست و ئارەزووەکانی بۆ دەستەبەر بکات ، هەر بۆیە ئەو هەلە لەبەر دەستیدایە بۆ موتاڵا کردن لەسەردان و میوانداری کردندا خەرجی بکات .

ئایا پیاوێکی لەو جۆرە ئەتوانێ بەهۆی لێکۆڵینەوەو موتاڵاکردنەوە بێتە کەسێکی دانشمەند ..؟

ئایا ئەو خانمەش مێردەکەی بەو جۆرو ناچار ئەکات دروستە بەقەرزاری خۆی بزانێت ..؟

من دەڵێم :- ژنی لەوجۆرە تەنانەت لەسەركەوتنی مێردەكەشیدا ، هیچ جۆرە مافێكی لەئەستۆی پیاوەكەیدا نییە ، چونكە ئەگەر ئەو بوبێتە هۆی دەوڵەمەند كردنی پیاوەكەی دیارە بێگومان لەبەر خاتری خواست و هەواو هەوەسەكانی خۆی بووە نەك هەردوكیان .

... ژن تەنها لەڕێگەی بەخشینی سۆزو ئیلهامەوە ئەتوانێ ئامێزی شادمانی و سەركەوتن بۆ مێردەكەی بگرێتەوە نەك بە زەبرو زۆر ، بەڵكو لەڕێگەی ستایش و هاندان و وەسف كردنی خەسڵەتی جوان ئەتوانێ ئەو كەسێتییەی ئەو خوازیاریەتی ڕاست و ڕێك پێی ببەخشێت ؛ گەر هات و مێردەكەی دوچاری كارەساتێكی ترسناك بوبو ئینوی بڕوا بەخۆبون بوو ، ئەوا پێویستە بەوردی ئەو ڕوداوانەی وەبیربێنێتەوە كەپێشتر سەركەوتنی تێدا بەدەست هێناوە ، پێی بڵێت :-

☜ ئەو ڕۆژانەت لەیادە لەفڵانە كاردا ترس و بیمێكی زۆرت لێ نیشتبوو دوچاری دڵە ڕاوكێ و بێزاری بوبویت ..؟ كەچی هەركە وەلاتناو پشت گوێت خست و مەسەلەكەت بەلاوەكی تەماشاكرد چۆن خۆی بۆخۆی چارە سەر بوو ...؟

لێرەدا پیاو كەهەستی بەوە كرد ئەوا ژنەكەی ئەو بەكەسێكی بوێرو دلێر ئەزانێ و نمونەی دلاوەریشی وەبیر دێنێتەوە ؛ ئیدی چەند هێندەی تر خۆی بەپاڵەوانێكی ئەبەز دێتە بەر چاو ئەو ورەو ئینە ناوەكییەی ئەو پێی بەخشی دەبنە فاكتەری پلەكانی سەركەوتن بەسەر كۆسپ و لەمپەرەكانی ژیاندا .

ئایا ئێوە بەمجۆرە پێتان باش نییە ..؟

یاخود بەمێردەكەتان بڵێن :_ تۆ بۆ هێندە ترسنۆكیت و ناوێریت هیچ شتێك دەربارەی خۆت بڵێیت ، یان بۆ هێندە نەوێریت ، تۆ هەمیشە هەروەها بویت و

هیچ کارێکت لەدەست نەهاتووە ، هەروا دەستە وسان بویت ، یان تۆ کەی شایانی ئەوەیت خاوەنی ژنێکی سەنگین و سەلاری وەك من بیت ، تەماشا ...؟

من بەم ژنێتیەی خۆمەوە توانای ئەوەم هەیەئەو کێشەیەی تۆ زەندەقت لێی چووە زاڵ ببم بەسەریدا ، کەچی تۆ بەو پیاوێتی یەی خۆتەوە تۆزقاڵێك ورەو بوێریت تێدا نییە ..

ناو زەدکردنی ئەمجۆرە تانەو تەشەرو توانج و سەرزەنشت کردنانە خۆی لەخۆیدا گورزێکی کاریگەرەوبەتایبەت بۆ پیاو کەکسێتییەکەی خۆی بە شتێکی ناسك و پیرۆز ئەزانێ، کەواتە بەمجۆرە ڕەفتارانە ئەویش توشی ئیفلیجی دێت و زەبری وەبەردەکەوێت .

خانمی بەڕێز :-

☜ پێویستە بەشێوەك لەگەڵ مێردەکەتدا بدوێیت، مایەی سەربلندی و شانازی کردنی بێت و بێتە هۆی وەگەڕخستنی، بەڵام بەبریندارکردنی هەستەکانی ئەو زۆر دور نییە شوێنەواری ناڕاستەخۆ بەجێ بێلێت.

خاتو (مارگارد کالکین) زۆرینەی ڕاپۆرتەکانی لە گۆڤاری "کاسمو پلیتین" کە دەربارەی بابەتە فێرکارییەکانن . ئەو ئەلێت :-

☜ گریمان پیاو لە ئیدارەیەکدایەو خاوەنی پۆستێکی باش نییە بەچاکیش کار ناکات، کەسانی پلە داری لەخۆی بەرز تریش ڕازی نین لە کارەکانی ، لێرەدا ئەم پیاوە نابێت لەماڵەوە هاوسەرەکەی بێتە هۆی ئازاردانی و کونە جەرگی بکات و پێی بلێت :

تۆ هەرئەبێت بە دوا کەوتویی بمێنیتەوە، چونکە هیچت لەبارەدا نییە و هیچ کارێکی باشتریشت لێ ناوەشێتەوە

ئەو پێویستە بەیانی و ئێوارە و کاتەکانی پشوو کۆمەڵە قەیەکی بۆ بکات کە وابزانێت کەسێکی لێهاتوو بە توانا و سەرکەوتووە تا هەنگاوەکانی گەورە تر بکات، بەلاّم ژنێك هەمیشە بە مێردەکەی بڵێت :

تۆ هیچت بە هیچ نابێت ... ئەم ڕستەیە ئەبێتە هاندەرێك تا لە ڕاستیشدا هیچی بە هیچ نەبێت .

بۆچونەکەی خانم (کالکین) لەم ڕستەیەی دوایدا پڕاو پڕ تەواوە، چونکە ژن ئەتوانێت بە کۆمەڵێك ڕستەی توانا و ورە بەخش پیاوەکەی بگەیەنێتە لوتکەو کەسێتیەکی نەشازو توانای لێهاتویەکی بۆ دەستەبەر بکات

لێرەدا پێم باشە بەسەر هاتەکەی بەڕێز (تۆماس جانسون) کە لە جەنگی جیهانی دووەمدا بەسەری هاتوە من لە زمانی خۆیەوە وەرم گرتوە سەرنجی ئێوەی پێڕاکێشم کە ژن کاریگەریەکی چەند بەهێزی لە سەر کەسایەتی پیاو هەیە ..

بەڕێز : (تۆماس جانسون) لە میانەی جەنگی جیهانی دووەمدا سەربازێکی گەنجی خوێنگەرم بوو ئەو لە یەکێك لە بەرەکانی جەنگدا کە ناوی شوێنەکەم لە یاد نەماوە، قاچی بە خەستی پێکرابوو برینەکەی هێندە قوڵو کاریگەر بوو ناچار بوو ڕەوانەی نەخۆشخانەی سەربازی بکەن

ئەو پاش خستنە ژێر چاودێری و تیمار کردنەوە برینەکەی چارەسەرێکی ئەوتۆ نەکراو سەربازێکی لاو گەنج بە قاچی بریندارو کەم ئەندامەوە بەرەو ماڵ گەڕایەوە

خانم جانسون پێی ووتم :

☜ بەر لە بریندار بوونی حەزی لە مەلەکردن بوو، لەم بوارەشدا شارەزایی تەواوی بەدەست هێنا بوو ڕۆژێك بۆ گەڕان چوینە کەنار دەریاو (تۆماس) بۆ

مەلەکردن خۆیخستە ئاوەکەوە بە هەمان قاچی ناتەواویەوە هێندە مەلەی کرد تا بەتەواوی ماندو بوو بۆ پشودان لە تەنکایی کەنار ئاوەکەدا لێی ڕاکشا ..

کۆمەڵێکی زۆریش لەو ئاوە بوون بۆ کات بەسەر بردن و پشوودان، کاتی تۆماس لە کەنار ئاوەکە بۆ پشودان پاڵکەوت : سەرنجی هەندێك لە پیاوو ژنەکانی بە قاچە ناتەواوەکەی ڕاکێشا هەموو تەماشای شوێنەواری ناشرینی ئەو برینەیان ئەکرد کە بە قاچیەوە بوون

(تۆماس) لەوەوبەر هێندە گوێی پێنەئەدا و تەماشای قاچی خۆی نەئەکرد، بەڵام ئەو رۆژە تەماشا کردنی خەڵکەکە و وردبونەوە لێی ئەوی خستە گومانەوە و هەر بۆیە لە جێگەکەی خۆی ڕاپەڕی و هەر بە پەلە خۆی لەبەر کرد و بەرەو ماڵەوە گەڕاینەوە، هەر لە هەڵسوکەوتەکەیەوە بۆم دەرکەوت بێزار بوە بەوەی لە ناو خەڵکیدا ئەو خۆی بە کەسێکی نەشاز ئەبینیەوە

(جانسون) قسەکانی بە خانم بڕی و ووتی :

تۆ ئەو ڕۆژە دەرکت بە هەموو هەستەکانی من کرد، بەڵام لەسەرو ئەمەشەوە کاردانەوەی زیاتری تۆ بوو کە ئەو حاڵەت بەسەر خۆدا نەهێناو زۆر بەشێوەیەکی ئاسایی لەگەڵ مندا هاتینەوە بۆ ماڵەوە و دانت بە خۆتدا گرت تا کاتی لەبار و گونجاوی خۆی دێت ..

خانم (جانسون) هێندە بە چاوی ئاساییەوە ئەیڕوانیە قاچی مێردەکەی هەر ئەتوت هیچ شتێك لە گۆڕێ نییە، و قاچی مێردەکەی قاچێکی تەواو بێ کەم و کورتیە ئەوجا خانم درێژەی بە قسەکانی داو ووتی :

تاکو ڕۆژی یەکشەممەی داهاتوو چاوەڕوانیم کرد، بەیانی ڕۆژی یەك شەممە پاشان داوام لە (تۆماس) کرد کە پێکەوە بچینەوە کەناری دەریا

کەچی (تۆماس) داوای لێبوردنی لێکردم و ووتی :

توانا و تاقەتی مەلەكردنم نییە ..

ئەمەویّ بەتەنیا لە ماڵەوە بمێنمەوە و چاوەڕوانی من مەكەو تۆ بۆخۆت بڕۆ ..!

منیش هۆكاری بێزاریەكەی (تۆماس)م ئەزانی لەو ڕۆژەوەی هەستی كردوە كە ئەو خەڵكە لە قاچی ئەو ورد ئەبونەوە، بۆتە گرێ كوێرەیەك ئەگینا هەروا بە ئاسانی ئارەزوی مەلەكردنی دائەنەسرەوت، هەربۆیە پێم ووت :

(تۆماس) چاك ئەزانم كە بۆ چی نایەیت بۆ كەنار دەریا ..!

تۆ ئەتەوێت بە هۆی ئەو شوێنەوارەی كە لە قاچتدا دروست بوە تۆیش گرفتێك بۆخۆت پێش بهێنیت

بەڕێز (جانسون) لە بارەی ڕونكردنەوەی ژنەكەیەوە ئەڵێت :

قسەكانی من بە ڕاستی دروست بوون، ئەو ڕۆژە ئەو قسەیەكی پێ ووتم كە هەرگیز فەرامۆشی ناكەم، ئەو قسانە بونە هۆی هاندانم و شادمانی كردم كە بچمەوە كەنار دەریا، بەڕاست لەبیرتە ئەو ڕۆژە چیت ووت..؟

خانم (جانسون) زەردەخەنەیەكی كرد و ووتی :

- نا .. ئەو ڕۆژەی ئەو قسانەم كرد چەندەها جار لەبەر خۆمەوە وتبومنەوە تاكو بەتەواوی ببنە شتێكی ئاسایی و بەرەنجامێكی هەبێتن هەر بۆیە هەرگیز لەیادتان ناكەم

ئەو ڕۆژە پێم ووت :

تامی شوێنەواری ئەو برینەی كە بە قاچی تۆوە ماوەتەوە قەواڵەی خەڵات و شاهیدی لێهاتوییەكانی تۆن، تۆ بە تەواوی شانازیەوە ئەو قەواڵەی لێهاتوییەت بە دەست هێناوە جا بۆیە هەوڵێ ئەوە بدە كە بیشاریتەوە بیرێك لەوەش بكەرەوە بە چ هۆیەك قاچت بریندار بوە، ئەوەش بە شانازی و سەر بەرزییەوە وەربگرەو، خێراكەو هەستە با بچین بۆ مەلەكردن

خانم (تۆماس جانسون) بەم ڕونکردنەوەو پێناسە زرنگانە گرێ کوێرەو مەتەڵەکەی دەرونی مێردەکەی چارەسەر کرد بەرلەوەی لە خۆی ئاڵۆز تری بکات ..

چەند ساڵێك لەمەوبەر یەکێتی بەرپرسانی ژوری بازرگانی شاری (بوستون) بە مەستی فێرکاری هونەری مامەڵەکردن چەند پۆلێکیان دامەزراند کە فرۆشیاران شەوانە بەشداریان تێدا دەکرد، زۆرینەی بەشدار بوان نزیکەی ٥٠٠ کەسێك ئەبون پێك هاتبون لە سەرۆك و خاوەن کۆمپانیا گەورەکان و بازرگانی باوەڕ پێکراو بوون، شەوی پێنجەم واتە دانیشتنی کۆتایی پۆل ڕاگەیەنرا ژنی بەشدار بوان ئامادەبن ڕاهێنەران و پسپۆڕانی تایبەتمەند کە ئەو پۆلانەیان بەڕێوە ئەبرد.

لە میانەی ڕێنماییەکانیاندا ئەوەیان بە ژنەکان ووت :

ژنانیش چۆن ئەبنە ئەو فاکتەرو وەگەڕخەرەی هانی مێردەکانیان بدەن تا لە کارە کانیاندا سەرکەوتن بە دەست بێنن.

دکتۆر (دیویدگی) ڕاویژکارو پسپۆڕی فێرکردنی هونەری مامەڵەکردن دانەری کتێبی " دەست بە ژیانێکی نوێ بکە "

یەکێ لە ووتار بێژەکانی کۆتا دانیشتنەکان بوو بە ژنانی ڕاگەیاند :

.. ئەگەر دەتانەوێت مێردەکانتان ببێتە خاوەن سەرمایەیەکی چاك و لە مامەڵە کردندا سەرکەوتوو بێت، هەموو بەیانیەك بەر لەوەی لە ماڵ دەربچێت،بە کۆمەڵێك وشەی چالاکی بەخش دەمە زەردی دەرونیان بکەنەوە.

هەریەکێك لە ئێوە وا بۆمێردەکەی دەربخات ئەو هەمان ئەو مێردە شیاوەیە کە شایانی مێردایەتی یە .. بۆ نمونە پێی ی بڵێت:

☜ ئەمرۆ سیماو ڕوخسارت چەند گەشاوەیە، بەبڕوای من ئەمڕۆ لە دوێنێ چاك تر و چالاك تری، چەند سەلیقەیەكی جوانت لە پۆشاك و جلەكانتدا بەكار هێناوە، كاتی لەماڵ دەرچوونی مێردەكانتان كارێكی وا مەكە ئەو ڕوداوەی دوێنێ شەوی ڕابوردو لە میوانداریەكدا ڕویدا بیكێشیتەوە بە ناوچاویدا بیخەیتەوە یادی ئێوە لێرەدا ڕۆڵێكی گرنگ ئەبینن پێویستە پێتان بڵێین، ئەگەر بەم ویقارو چوست و چالاكیەوە بچیتە سەر كار، دڵنیابە تەلی كڕیاران بەلای خۆتدا ڕائەكێشیت سەركەوتن لە بواری مامەڵەكەتدا بەدەست دێنێت.

كاتێك تایبەت مەندو ڕاوێژكارێكی بە ئەزمونی وەك (دكتۆر پاوەرز) كە شۆرەتی ئەو شۆرەتێكی ڕاستەقینەیە وەها ڕەوشێك بە شیاوی سەركەوتن لە قەڵەم نەدات، بەلای ئێمەشەوە كارپێكردنی ئامۆژگاریەكەی ئەو جێگەی گومان نییە، هەر هیچ نەبێت بڕوامان بەوە هەیە كە كارپێكردنی ئەو ئامۆژگاریە ئەگەر پڕاوپڕ جێگەی سود نەبێت خۆ زیانێكی نییە ..

ئەگەر سەرێك بدەین لە مێژووی ژیانی ئادەمیزاد ئەتوانین بەدرێژایی مێژوو كەسانی بەد بەخت و ناكام بدۆزینەوە كە لە ڕێگەی ورە وەبەرنان و هاندانەوە بە شێوەیەكی موعجیزە ئاسا بە ترۆپكی سەركەوتن و كامەرانی و سەربەرزی گەیشتون، ئەگەر پێت وایە من زیادە ڕۆیم كردبێت چاكتر وایە چاوێك بە كتێبەكانی مێردەكەمدا (دیل كارنگی) بگێڕیت كەمونەكانی هەموو ڕاستەقینەو زیندوون

من تەنها بەسەرهاتی (الی كلبرستون) كە بە جادوگەر) بەناوبانگەو بە شێوەیەكی كورت گفتوگۆیەكی لەگەڵ مێردەكەمدا سازكردوە ئەڵێت :

لە ساڵی ١٩٤٢ كە هاتمە وڵاتی ئەمریكاوە كەسێكی دۆڕاوو بەدبەخت بووم هیچ كارێكم لە دەست نەدەهات تەنانەت لەبواری ئەم یاریەشدا لاواز بووم، بەڵام دوای ئەوەی لەگەڵ (ژوزنین دیلون)دا هاوسەریم كرد، ئەو مامۆستای ئەم یاریە بوو ئیدی گریٚ كوێرەی بەختم كرایەوە، ئەو فێری كردم لەم یاریەدا خۆسازدان و ئامادەیی تەواوم هەبێت، من بەهۆی هاندان و سوركردنەوە گەیشتمە ئەو پلە بەرزەی ئەمڕۆ لە جیهاندا دەنگم داوەتەوە، خودی بەرێزیشت بۆ چاوپێكەوتن لەگەڵ من سەدەها كیلۆ مەترت بڕیوە ..!

هاندان و چاككردنی لێزانانە شێوەیەكی تاقیكراوەو بردنەوە ئامێزە و ئێوەش ئەم ڕەوشە بگرنە بەر لەوانەیە بەم شێوەیە كەسایەتی مێردەكانتان گۆڕانكاری بەسەردا بێت و ئەو مێردەی لێدەربچێت كە تۆش ئارەزوی ئەگەیت ..

## ٧... کاتێ کارەکان لەگەڵ خۆزگەکاندا گونجاو نین، بەرەو بڕوای تەواو هەنگاو هەڵگرە ..

نزیکەی دە ساڵێکی مابو بۆ پێنانە سەدەی بیستەم سەدەی پیشەسازی و تەکنەلۆژیا سەدەی پشکنینی چینەکانی ئاسمان و سەدەی کۆمپیوتەر کۆمپانیای کارەبا و ڕوناکی (دیترویت) کە لە فەرمانڕەوایی (میشگان)ە ئەم شانازیەی کردە پشکی خۆی و لە داهێنانەکەی ئەدیسۆن بۆ ڕوناك کردنەوەی ماڵی خەڵکی سودی گرنگی بینی

لە بەڕێوەبەرایەتی کارخانەو هەبوونی کۆمەڵێك داینەمۆ و تایبەتمەند کە چاودێری وزە بەرهەم هێنەرەکان بن پێویستیەکی زۆری هەبوو.

یەکێك لەو کەسە میکانیکیانە لاوێکی هەڵکەوتوبو کە هەفتەی بە ١١ دۆلار کاری بۆ ئەو کۆمپانیایە ئەکرد، ئەم لاوە خوێن گەرمە ڕۆژی ١٠ کاتژمێر کرێکاری بۆ کۆمپانیا ئەکرد، کاتێك بۆ کۆمپانیا ئەگەڕایەوە بێوچان لە کایەنێکی پشت ماڵەکەی خۆیدا سەرگەرمی دروست کردنی جۆرە شتێك بوو وەك (ماشێن) ئوتومبێل.

باوکی ئەم لاوە کابرایەکی وەرزێر بوو، دڵنیا بوو لەوەی کوڕەکەی ڕەنجێکی بێ سود ئەداتو لە ئەنجامدا بێهودە ئەبێت، هاوسێکانی کاری ئەم لاوەیان بە (ئاو لە دنگدا کوتان) ئەزانی هەموویان گاڵتەیان پێئەکرد، بە خەیاڵی هیچ کەسێکدا ئەدەهات هەوڵ و کۆششی ئەم لاوە سود و بەرەنجامێکی هەبێت.

هەموو کەسێك پێی وابوو کات و تەمەنی بێهودە بە فیڕۆ ئەڕوات تەنها ژنەکەی نەبێت

ئەم ژنە میهرەبانە شەوانە پاش تەواو کردنی کارەکانی ماڵەوە، بەدوای مێردەکەیدا دەڕۆیشت و لە هەوڵی ئەوەدا بوو هەمیشە چاودێری بکات.

زستانان لەو کایەنە گەورەیەدا کە سەرمای لە ئەندازە بەدەر بوو، چرای ئەوتی بۆ بەدەستەوە ئەگرت و ئەوەستا بەدیاریەوە تاوەکو مێردەکەی بتوانێت درێژە بە کارەکەی بدات، ددانەکانی ئەم ژن و مێردە بەستەزمانە چزقەچزقی بوو .. مێردەکەی لەگەڵ گەرمی کارەکەیدا نوقوم ئەبوو ژن لە سەرمادا هەڵئەلەرزی، بەڵام ئەم هەڵلەرزینە ڕوکەش بوو چونکە بڕوا بوون بەکاری مێردەکەی گەرمی ئەکردەوە سەرما دەست و پەنجەی ئەم ژنەی ئەتەزاند، کاتێ هالاوی گەرمی هەناسەی ئەکرد بە دەستەکانیدا و گەرمی ئەکردەوە، ئەو هەڵمەی کە لە دەمیەوە دەرئەچوو کەش و هەوایەکی تەماوی لەبەر چاویدا وێنا ئەکرد، بەڵام بە هیچ جۆرێك ناخ و دەرونی تەم داینەئەگرت چونکە گەیشتبو بە بەرەنجامی کاری مێردەکەی خۆی، ئەم ژنە هێندە چاودێرو پارێزگارو هاندەری مێردەکەی بوو کە مێردەکەی ناوی لێنابوو (فریشتەی نیمان) .

سەرەنجام پاش سێ ساڵی ڕەبەق کارو ماندو بوون .. لەو کایەنەدا.. ئوتومبێلی گەورە دڵ کەوتە کار لە ساڵی ١٨٩٣ زاینی واتە بەر لەوەی تەمەنی ئەم لاوە بگات سی ساڵەیی، دراوسێکانی لە بیستنی ئەم دەنگە سەرسوڕهێنەرو نامۆیە هەموویان لە جێگەی خۆیان دەرپەڕین و کەوتنە مقۆمقۆ کردن خۆیان گەیاندە ناڕاستەو دەنگەکەی لەو کایەنەوە بەرز ئەبویەوە، لەوانەبوو گەر تاریکی بواری بدایە بیانکردایەتەوە گاڵتە جاڕی – هەموو بەردو پەنجەرەی کایەنەکە شالاویان برد.

ئێستا ئەتوانین بەتەواوی ناوەوە ببینین، ئەوان بە چاوی واق ورماوی و سەیرو سەمەرەییەوە ئەیانڕوانیە (هانری فورد وژنەکەی) کە سواری گالیسکەیەکی بێ ئەسپ بوون و لەم سەرەو سەری کایەنەکەدا دێن و دەچن....!

ئەو شەوە بونیاد نانێکی مەزن پێینایە دونیای بونەوەرەوە، داهێنان و دروست کردنێك کە لە دوای ئەوان کاریگەریەکی ئێکجار گرنگی لە چارەنوسی مرۆڤایەتیدا بەجێ هێشت .

ئەگەر گریمانێك دابنێین کە (هانری فورد) بە باوکی ئوتومبێل بزانین ئەبێت بە ویژدانەوە ئەو مافەش بدەین کە ژنی بە باوەڕو بیر تیژی ئەو بە دایکی ئوتومبێل بزانین .

٥٠ ساڵ لە پاش داهێنانی ئوتومبێل لە بەڕێز (هانری فورد)یان پرسی :

ئەگەر بڕیار بێت سەرلە نوێ ژیانت بۆ تازە بکرێتەوە چی ئەکەیت ..؟

بەڕێز (هانری فورد) بە سادەی و خەندەیەکەوە لە وەڵامدا ووتی :

- هیچ شتێکم ناوێت تەنها ئەوەنەبێت لەگەڵ ژنەکەمدا بم ..!

(بەڕێز(هانری فورد) تاکۆتایی تەمەنی ژنەکەی هەر بە (فریشتەی ئیمان) بانگ ئەکرد، ئارەزوی ئەکرد هەتاهەتایە هەر لەگەڵ ئەودا بێت.

هەر پیاوێك پێویستی بە (فریشتەی ئیمان) هەیەو هەر کاتێ هەموو شت و هەموو کەسێك لەگەڵیاندا ناجۆر و نەگونجاون ئەو ژنە بە بیرو ڕای تەواوەوە ورەو تینی دڵ و دەرونی پێئەبەخشێت ..

کاتێك پیاو دەست و پێی خۆی ون ئەکات و توشی شکستی و ناکامی ئەبێت لە بڵێسەی ئاگری ڕەشبینیدا ئەسوتێ هەست بەوە ئەکات هەموو شتێك بەرامبەری ناجۆرە ئەوکاتە ئەو پێویستی بەژنێکە کەببێتە بەخشەر و توانای باوەڕبەخۆبونی پێ ببەخشێت بڕواو سەقامگیر بونی شوێنی ژنەکە

زەمینە بۆ سەرکەوتنی مێرد ساز ئەکات ئایندەی تەڵخ و تەماوی بۆ رۆشن ئەکاتەوە، ئەو ئامادەییەی پێ ئەبەخشێت کە بۆ ململانێی کێشەو گرفتەکانی ساز ئەکات، بڕواو ئیرادەو شکست و ناکامی دوو هێڵی تەریب بە یەکترن و کەسی کامەران و سەرکەوتوو بە بڕواو ئیرادەی تەواوەوە ملی ئەو رێگەیەی کە پڕە لە هەورازو نشێو وپشتی دژواریەکانی پێ ئەشکێنێت و ئەگاتە لوتکەی بەختەوەری.

لێرەدا باسی ژیانی بەڕێز"روبرت دوپر "کەخەڵکی شاری "کانت تی کات" گەواهی دەری ڕاستێتی ئەم بەڵگەیەیە. ئەو هیواخوازی ئەوە بوو بێتە بەڵێندەرو فرۆشیارێکی سەرکەوتوو .

بەدەر لە دەقەکە :- خاتو کارنگی..سەبارەت بەزاراوەی فرۆشیار .. مەبەستی سەرەکی لەکەسێکی ئەمریکییەو بۆ خوێنەرانی کورد زمان کەمێ رونکردنەوەی پێویستە :-

(لە ئەمریکادا بەکەسانێك ئەوترێت فرۆشیار لەلایەن کۆمپانیاکان و ناوەندە گەورە بەرهەم هێنەرەکانی کاڵاو شمەکە جۆراو جۆرەکانەوە وەر ئەگیرێن تا ببنە نوێنەری ئەو کۆمپانیاو ناوەندانەو بۆ مەبەستی ڕاگەیاندن و ریکلام لە میدیاو کەناڵەکانی ڕادیۆو تەلەفزیوندان ، ئەم کەسانە چاودێرن و بەوتاری کاریگەر کاڵا و شمەکی کۆمپانیاکان لەژێر ڕکێفی خۆیاندا بەخەڵکی ئەناسێنن و نمایشیان ئەکەن و دەبنە هاندەری کڕینی ، لەئەمریکادا ئەم پیشەیە بایەخ و گرنگییەکی لەڕادەبەدەری پێئەدرێت هەر بۆیە فرۆشیارێك دەبێت خاوەنی کەسێتییەکی ئەشازو سەرنج ڕاکێش بێت هاوکات کەسێکی خۆش مەشرەف و زمان پاراووخاوەن بڕوانامەیەکی بەرزیش بێت.

ئەو فرۆشیارانەی باسمان كرد لەئەمریكادا بەرنامەی كەناڵەكانی ڕادیۆو – تەلەفزیۆنییان هەیە هێندە بەناوبانگ و ئەشارەزن بەدەستهێنانی ئەو جۆرە پیشەیە شتێكی دەگمەنە .. بۆ نمونە :-

(أرتوو گادتری) یەكێك لەو فرۆشیارانە بوو كە لە ڕادیۆو تەلەفیزیۆندا بەرنامەی تایبەتی هەبوو پلەو پایەی ناوبراو لە ئەمریكادا هێندە گرنگ بوو، كە چەندینجار كەناڵە تەلەفیزیۆنیەكانی گوزارشەكانی ئەویان پەخش ئەكرد تەنانەت زۆرینەی كاتەكانی پشوو بەسەر بردنی (ایزنهاور)ی سەرەك كۆماری ئەمریكا لەگەڵ ئەودا بوو.

لایەنگرانی بەڕێز (گادنری) بەبێ ئارامیەوە چاوەڕوانی دەسپێكردنی بەرنامەكانی ئەو بوون و تام و چێژی تایبەتیان لە خۆش مامەڵەیی و زمان پاراوی ئەو ئەبرد..

بەڕێز (ڕوبرت دوپر) لە ساڵی ١٩٤٧ بوبە فرۆشیاری (بیمە) ئەو بەتەواوی هەوڵ و كۆششەكانیەوە لەم كارەیدا سەركەوتوو نەبوو، تا لە دوایدا كە بینی هەوڵ و كۆششەكەی هیچ جێگەیەكی بۆ ناگرێت، بەرلەوەی غەم و پەژارە لەم كارەیدا بە چۆكیدا بێنێت دەستی لە كار نەكێشایەوە .

بەڕێز (دوپر) لەو یادداشتەیدا كە بە ڕاستی ئێستا لەبەر دەستمدایە ئەڵێت :

من دڵنیام لەوەی هەرگیز لەم كارەدا سەركەوتوو نابم بەڵام، (دوریس)ی ژنم، جەختی لەسەر ئەوە كردەوە كە ئەم سەركەوتنە درێژخایەن نابێت ماوەكەی كورتە هەمیشە ئەیووت:

ڕوبرت غەم مەخۆ من ئەزانم كە ئامادەیی لەم كارەی تۆدا شاراوەیە جارێكی دیكە هەوڵ بدە، دڵنیام ئەمجارەیان سەركەوتوو ئەبیت، هەرچەند هەوڵەكانی من

جێگەی نەنەگرت و پوچەڵ نەبوون ..بە ناچار لەتەك (دوریس)دا لە کارخانەکەیدا سەرگەرمی کار کردن بوین .

لە هەمان ئەو ڕۆژانەدا بەردەوام (دوریس) لەگەڵ مندا خەریك بوو پێی ئەووتم : خوداوەند تۆی بۆ فرۆشیاری خولقاندووە، تۆ بە شێوەیەکی سروشتی توانا و لێهاتووی ئەم کارەت هەیە. (دوریس) کۆمەڵە خەسڵەتێکی ئەدایە پاڵم و تایبەت مەندێتی وەهای تێدا بەرجەستە ئەکردم کە دەرونم لەو خەسڵەت و تایبەت مەندیانە هیچ هەواڵێکیان نەبوو، سەرەنجام پاش ساڵ و نیوێك کارکردن لە کار خانەدا سووربون و هاندانی ئەو کاری خۆی کرد و منی گەیاندە مەیدانی فرۆشیاری، ئەمەش بە ویژدانەوە ئەڵێم کە هەر ئەو جەخت و پێداگیریانەی ئەو بوو منی گەیاندە لوتکە.

من ئەمتەتوانی لەگەڵ ئەو ئیرادەو بیرو باوەڕەی کە ئەو هەیبوو بەردەوامی نیشان بدەم و خۆم بدەم بەدەستەوە،ئەو نەك تەنها زاڵ بوو بەسەر خۆ بە دەستەوە دانم، بەڵکو توانی لە دڵ و دەرونی کەسێکی ڕەش بینی وەك مندا تۆوی ئیرادە و بڕوا بچێنێت و بڕوا بە لێهاتوییەکەم بەهێز بکات.

جگە لە بیرو باوەڕی خۆم بیرو باوەڕی ژنەکەشم توێشوی ئەو ڕێگەیەم بوو، من سوپاسی بێ پایانی ئەو ئەکەم، چونکە تاکە هاندەرێکی سەرەکی سەرکەوتنم بوو، بۆی سەلماندم کە (خواستن – توانایی یە)

ئەو ژنانەی ورەو توانای مێردەکنیان بەهێز ئەکەن، بواری ئەوە نادەن مێردەکانیان بە شکست و ڕیسوایی بێنێتەوە.

ئەو جۆرە ژنانەی مێردەکانیان لە ململانێ و ئەبەردی ژیاندا بەزیون و بە چۆکدا هاتوون، دەسبەجێ دەستی یارمەتیان بۆ درێژ ئەکەن و بەرزیان ئەکەنەوە تا

جارێکی دی بکەونەوە سەر پێی خۆیان و بە وەرەیەکی دوو بەرامبەرەوە ئەیان نێرنەوە مەیدانی ئەبەردی و سەرلە نوێ ململانێکە دەست پێنەکەنەوە.

(سرگی راچما نیوف) مۆسیقاری ڕوسی لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵەییدا بەناوی ناهەنگ سازێکی مەزنەوە دەنگی دابویەوە، ئەو بە بڕوا بوون، بە هونەرەکەی توشی غرور بوو.

کاتێ تەماشای کرد سەمفۆنیا نوێیەکەی بەهیچ جۆرێك گرنگیەکی ئەوتۆی پێنادرێ، کارەکەی ڕوو لە نشێوە ئیدی هێندە دوچاری غەم و پەژارە بوو بۆ ماوەیەکی زۆر توشی گۆشەگیری بوو وایلێهات دەرگای بە ڕووی هاوەڵانیدا دانەخستەوە، لە گێژاوی خەم و خەیاڵ و ئەندێشەدا ئەتلایەوە، هاوەڵەکانی بەو شێوەیە بینیان بردیانە لای پزیشکی تایبەتمەندی نەخۆشیە دەرونیەکان.

دکتۆر (داهل) لە میانەی چارەسەرکردنی (سرگی)دا هەمیشە ئەوەی بۆ دوپات ئەکردەوە کە دروستکردنی شاکاری بێ وێنە لەبەر دەستی ورەو توانای تۆدا دەستەو سانە تۆ پێویستە مەیدانی بەخۆدا چونەوە بۆت برەخسێنی،بیرو ڕاکانی دکتور وردە وردە لەمێشکیدا جێگەیان بۆخۆیان سازکرد و بونە هۆی بەهێزکردنی دەرونی ؛ مەبەستی "راچمانیوف"لەئامادەیی خۆ تەیار کردندا خولقاو هاتە مەیدانی کارکردنەوە ، ساڵێك بەسەر ئەم چارە سەرکردنەدا تێپەڕی ئەکردبوو کە کونسیرتی ژمارە ٢ کە یەکێکە لەشاکارە بەناو بانگەکەکانی ئامادە کرد و پێشکەشی دکتوری کرد.

بۆ یەکەمجارکۆنسێرتی ژمارە دوو نمایش ئەکرا، ئامادە بوان هێندە بەکەیف و خۆشحاڵیەوە تامەزرۆی دیتنی "راچمانیوف"بوون، کاتی هاتنە ژورەوەی بۆهۆڵی نمایشکردنەکە دەسکرا بەچەپڵە لێدان و هەڵهەلە کێشانێك هۆڵەکەیان هێنابویە لەرزە . ئەو لەو شەوەدا بێ پەردە ڕایگەیاند، گەر دکتور"واهل"

نەبوایەتە تاکە هاندەرو وەگەڕخەرم بێگومان لەم ڕێزە شکۆمەندییەی ئێوە بێبەش نەبووم، وەك چۆن ئوتۆمبێل بەبێ سوتەمەنی و ئاوو ڕۆن ناکەوێتە بزاوتن، پیاویش بەبێ بوونی هاندەرێکی بڕوا بەخش توانای بڕینی هەورازو نشێوەکانی ژیانی نابێت .. هەرلەم ڕوانگەیەشەوە ئەتوانرێ بوترێت:-

***﴿هاندان ،شکستی ئەخاتەوە سەرپێ و بەرەو لوتکەی ئەبات﴾***

دیارە هەریەکەمان ڕوبەڕی ناکامی بوینەتەوەو تاڵی و ناسۆرییەکانی ژیانمان چەشتووە ، بەڵام لەوانەیە دەرکی تەواومان بەوە نەکردبێت ، کاتێ دەروغمان لەتەنگاوی نائومێدیدا دیلە ، گەر خۆشەویست و ئازیزێك پێمان بڵێت :-

نابێ هێندە گوێ بدەیتێ و ، ئەم پێشهاتە بێ بایەخە کاریگەری گرنگی لەسەر چارەنوسی تۆ هەبێت ...! من دڵنیام تۆ سەرکەوتو ئەبیت ... لەکتێبی "مقدس" پیرۆزدا هاتووە (باوەڕ)جەوهەرو کرۆکی خواستەکانمانە ، باوەڕ هێمایەکە بەچاوی بەرجەستەیی ناتوانرێ ببینرێت ، باوەڕی ڕاستەقینە باوەڕێکە پێویستە ژن بەچاکی هەڵوێستی لەبەرامبەردا بنوێنێ بۆ مێردەکەی بەگەشبینی و بیرتیژی و دیدی ئەویندارییەوە بڕوانێتە مێردەکەی .

کۆتا خاڵیش .. هەبونی بڕوا بێ هەوڵ و تەقالا کاڵ و کرچە و ئەوژنەیشی بەخشەری ئەو بڕوا ڕاستە قینەیەیە پێویستە لە ڕێگەی هاندان و خۆشەویستییەوە دەریبڕێت .

## (٨) کاری مێردەکەتان لەبەرچاو بگرن و کۆمەکی بکەن

بەڕێز (مایر فیشر) پیاوێکی خۆشبەخت و سەرکەوتووە، خودی خۆیشی دان بەمەدا ئەنێت کارەکەی ئەو لە مەڕ ساغردنەوەو فرۆشتنی کالاّ و پێویستیە کارەباییەکانی ناو ماڵەو خانم (مایر) بۆ برەو پێدانی کاری مێردەکەی لە هیچ هەوڵ و کۆششێك درێغی نەکردووە لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ خانم (فیشر) ووتی:

☜ مێردەکەم هێندە سەرگەرمی کارکردنەکەی خۆیەتی تەنانەت لە کاتی خواردن و خەوتن و پشودانەکانیشدا هەمیشە لە بیرکردنەوەی کارەکەیدایە .

ئەو زەوق و بەدڵ بونەی ئەویش کاریگەری لەسەر من هەبوە، بە درێژایی بیست و پێنج ساڵی هاوسەرێتی بە چەندین ڕێگەی جۆراو جۆر کۆمەکم پێ کردووەو لەم کارەش تام و چێژم بینیوە ..

لە خانم فیشرم پرسی :-

☜ ئێوە چۆن کۆمەکتان بە مێردەکەتان کردووە ..؟

لە وەڵامدا ووتی : کاتێ حەزو ئارەزوی ئەوم هەست پێکرد، منیش بیرم لە خۆم کردەوە، ئەگەر بتوانم کاری گچکە، بەڵام یەکانگیری ئەو کە بە ئاسانی ئەتوانم فێری بم ئەنجام بدەم، ئەویش فرسەتێکی زۆر تر لە بەر دەمیدا ئەبێت تاکو نوێ کاری لە کارەکەیدا بکات ئەو ئەتوانێت بە داهێنانەکانی زیاتر کڕیارەکان بە لای خۆیدا کێش بکاتو زەمینەی فرۆشتن فراوانتر بکات.

خانم (فیشر) زیاتر بۆی ڕونکردمەوە بەڕێز (فیشر) نوسینگەی زۆری بۆ کڕیارو فرۆشیارەکانی کالاّی کەل و پەلی پێداویستیە کارەباییەکان هەیەو، خانمیش

نامێری چاپ کردنی نوسینەکانی گرتۆتە دەست تاکو نوسینەکانی بۆ لە چاپ بدات خانم لە درێژەی وتەکانیدا ووتی :

مێردەکەم زۆر جار گەشتی درێژخایەن ئەکات و هەندێك جار سەردانی سێ شوێن ئەکات، هەر بۆیە لە میانەی گەشتەکانیدا شۆفێری کردن بڕێکی زۆر توانای مێردەکەمی کەم کردەوە، کاتێك زانیم گەشت کردن ئەبێتە هۆی کەلێنێك، خۆم فێری شۆفێری کردو ئەمەش بویە کۆمەکێکی گەورە بۆ ئەو و ئەزمونێکی چاك بۆ خۆیشم

لە درێژەی گفتو گۆکەی خانمدا تێگەیشتم تەنانەت سەرگەرمی ئەو بۆ کاری مێردەکەی زۆر بەکەلکە، هەمیشە خودی خۆیشی چێژی تایبەتی لێ ئەبینێت.

خانمە خۆشەویستەکان : هەر چەند ئەم کارە پەیوەندی بە منەوە نییە، کە تاکو ئێستا چۆن و بە چ شێوەیەك هەڵسوکەوتتان لەتەك مێردەکانتاندا کردووە بەڵام، چونکە هێندە حەز ئەکەم ئایندەیەکی چاکترو سەرکەوتوترتان بۆ دیاری بکەم، ئەوا مۆڵەت بە خۆم ئەدەم چەند داواکاریەکتان بە گوێدا بچرپێنم ئەوەش هەرگیز لە یاد نەکەن لە زۆرینەی سەرچاوەکانەوە کۆمەکەکانی ژیان وەگەڕخەری جموجوڵی دڵ و دەرونی پیاوە .

جۆرە کۆمەکێکی ئێوە پەیوەندیەکی تەواوی بە کارو پیشەکەی ئەوەوە هەیە، کە لەوانەیە مێردەکانتان بۆ ڕێکخستنی نوسراو و سەرپەرشتی هاتوچۆ پێویستی بە کەسێك هەبێت دڵسۆزانەو دور لە ڕیاکاری گوزارش و ئامارەکانی لە زەمینەی کارەکەیدا بەڕێوە بەرێت.

کێ نالێت وەڵام دانەوەی تەلەفۆنێکی ئەو کاریگەریەکی نابێت .. لەوانەیە ئەو پێویستی بە شۆفێرێك هەبێت تاکو ئەو بیرکردنەوەیەی لە کاتی شۆفێری کردندا لە دەستی ئەچێت لە لایەکی دیەوە خەرجی بکات .

چ عەیبێکی هەیە کە ببنە یاری دەدەرێکی مێردەکانتان، کاتێک تۆ گیانی هاوکاریت تێدایە ئەویش هەست بە بونی کەسێکی دڵسۆزو یاریدەدەر نەکات بە خۆشحاڵیەوە پێشوازی لەو پێشنیارانە نەکات تۆ نەیخەیتە بەر دەمی بۆ کۆمەك پێکردنی سەرنجی ئەم نمونە بچوکە بدەین بەڕێز (ئُرتاردو) پاش تەواو کردنی ڕاژەی سەربازی بە بڕە ٨٠٠ دۆلار کە کۆیکردبویەوە ئوتومبێلێکی پێ کڕی و پاشان کردیە ئوتومبێلی تاکسی سەر بە دامەزراوەی (لیمو زاین) و لەوێ ناونوسی کرد.

کاتێك کۆمپانیا لەبەر زیاد بونی ڕێژەی گەشتیاران پێ ڕانەگەیشت بە ئەندازەیەکی تەواو بچن بەدەم داواکاری گەشتیارانەوە،ی ئیدی سەری گلۆلەکە گەشتە دەستی (پیتر) و چو بە دەم داواکاری گەشتیارانەوە، خزمەتێکی هێندە باشی نەکردن ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەیان لە زیاد بوندا بوو بەڵام هێندە کارەکەی زۆر بوو فریای گواستنەوەی گەشتیاران نەئەکەوت بەتەنها و لە هەمان کاتیشدا وەڵامی تەلەفۆنەکان بداتەوە ،هەر بۆیە ژنەکەی پێشنیاری کرد هێڵێکی تەلەفۆنی بۆ ڕابکێشێتە ماڵەوە تاکو وەڵامی موشتەریەکانی بداتەوە، لەحاڵی حازرداو کاتی دانانی ئەم کتێبە گەشتیارانی(پیتر) بەئەندازەیەك زیادیان کردووە کەناچار بووە چەند شۆفێری تری بەکرێ گرتووە بەڵام سەرباری ئەوەی کەژنەکەی بەچاودێری و پەروەردەی سێ منداڵەوە خەریکە کارو باری ماڵ بەڕێوە ئەبات لەهەمان کاتیشدا وەڵامی تەلەفونەکان ئەداتەوە.

لەدیداری ئەم دوایین جارەکە لەگەڵ بەڕێز( پیتر ) دا سازمدا .. وتی :- من بە هیچ نرخێ یاریدەدرێکی چاکی وەك ژنەکەم چنگ ناکەوێ چونکە کەسێکی زۆر دڵسۆزو بێ وێنەیە لەوەڵامدانەوەی موشتەرییەکاندا هێندە زرنگە

ناوو ئەدرەســە گەشــتیارەکانی هــەموو لەبــەردو بەچــاکی ئەیانناسـێت ، کاتــێ پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵدا ئەبەستێ بەکۆمەڵێ وشەی سوپاس ئامێزەوە وەڵامیــان ئەداتەوە ، هەرکاتێکیش هەر پێویستییەکیان هــەبێ چــەندین جــار پەیوەنــدیان پێوەئەکەنەوە ، ئەوانیش هێندە بڕوایەکی بتەویان پێ بەخشــیوە ، کاتــێ لەگــەڵ هاوکارەکانمدا لەگەشتە درێژ خایەنەکاندایین مــاوەی گەڕانــەوەمان زۆر ئەخایــەنێ ئەو نایەڵێ لەچاوەڕوانیدا نائومێدی دایان بگرێــت و پەیوەنــدی بــەکۆمپانیاکانی ترەوە ئەکات و ئۆتۆمبیلیان بۆدابین ئەکات ، ئەتوانم بڵێم من بەبێ ئــەو هــەرگیز کارێکم لە دەست نایەت . پاش ئەم لێدوانەی بەڕێز (پیتر)ئۆبەی خانمە ســەبارەت بەخۆی ڕونکردنەوەیە بکات :- هیچ ژنێك هێندە سەرقاڵ نییە ئــەتوانێ یاریــدەی مێردەکەی بدات بەتایبەت ئــەو ژنانــەی لــەناخی دڵــەوە حــەز ئەکــەن یارمــەتی مێردەکانیــان بــدەن ، بــەڵام هەنــدێکی دیکــە حــەز ناکــەن بــەجۆرە یارمــەتی مێردەکانیان بــدەن گــەر بڕیــار بــدەن گۆڕانکارییــەك بکــەن بێگومــان ئــەتوانن کاتەکانی خۆیان وەها ڕێکبخەن هەلو مەرجی تــەواو بــۆ پیاوەکانیــان دەســتەبەر بکەن ، لێرەدا دەرەنجــامێکی هێنــدە مــەزنیان دەســگیر دەبێــت کــە پێویستی مێردەکانیان بەزیادەوە جێبەجێ ئەکەن و سەرکەوتن ئەکەنە چارەنوســیان ، خــانم لەدرێژەی قسەکانیدا سەبارەت بەچێژ وەرگــرتن لــەکارکردن لەگــەڵ پیــاودا وئــەو ژنانەی منداڵی بچوکیان نییە ڕونی کردەوە .

ئەو ژنانەی منداڵی بچــوکیان نییــە هەمیشــە لەپشــوحەواندنەوەدان و حەوسەڵەیان لەماڵەوە بەسەر ئەچێت ناچارن بەدوای سەرگەرمییەکدا بگەڕێن .

من بەم خانمانە ئەڵێم :- باشترین ســەرگەرمی بۆ ئــەوان کۆمــەککردنی مێردەکانیانە چونکە لێرەدا دو خەســڵەتی تایبــەت هەیــە ، یەکــەم .. فشــارێك

لەسەر مێردەکەیان کەم ئەکەنەوە و بوارێکی بۆ ئەڕەخسێنن بەدوای نوێکاریدا بگەڕێت .دووەم لەدڵەڕاوکێ و گومان دوریان ئەخاتەوە کەمێردەکانیان لەگەل فلانە ژنە یان فیارە خانمی دەنگ خۆشدایە ، ئەو بواردش ناهێڵنەوە بۆ کۆمەککردنی مێردەکانیان لەلایەن کەسانی بێگانەوە.

دکتور "بلا بالاس" یەکێکە لەپزیشکە ناسراوو بەناوبانگەکانی شاری نیۆیۆرك و بۆ ماوەیەك سکرتێری نەبوو ئەمەش بوە گرفتێك بۆی ، ژنەکەی دکتۆر سەیری کرد پیاوەکەی لەبەر بێ سکرتێری توشی گرفت بووە ، رۆژێك پێشنیاری ئەوەی بۆکرد تاکو پەیدا بونی سکرتیرێك رۆژانە ئەم لەگەڵیدا بێت و وەك بەرپرسی ئیدارەی عیادەکەی هاوکاری مێردەکەی بکات .. دکتۆر پێشنیارەکەی پەسەندکردو پێکەوە دەستبەکار بوون ، خانم هێندە بەدڵسۆزییەوە کاری ئەکرد تاکو ئێستا یاریدەدەری ئەوی لەئەستۆ گرتووە ، ئەو بەیانیان ئیش و کارەکانی ماڵەوە تەواو ئەکات و ئێوارانیش کاروباری مێردەکەی ، من خۆم کاتێ بۆدیتی ئەم ژن و مێردە چومە سەردانیان

دکتۆر "بالاس" ووتی:-یاریدەدانی من لەلایەن ژنەکەمەوە گرنگی زیاتری لەئەرك و پیشەکەم هەیەسەرەڕای ئەو بایەخدان و گرنگییەی ئەیدەمە ئەخۆشەکانم ئەویش بەهەمانشێوە بایەخ ئەداتە ئەوانەی رومان تێئەکەن ، من گەشتومەتە ئەو برِوایەی کۆمەکی ژن ئەبێتە هۆی جەوهەری کاری پیاو هەر لەروانگەی بیرۆکەکەی دکتور "بالاس"ەوە ئەتوانرێ بوترێت ، ژنانێك یاریدەدەری کارو باری مێردەکانیانن زۆر جار ئەیانگەیەننە ترۆپکی سەرکەوتن و تەنانەت ناوو شۆرەتیشیان پێدەر ئەکەن .

"انتونی ترلوپ"ڕومان نوسی بەناوبانگی ئینگلیزی ئەڵێت :- من هەر دێڕێکم نوسیبێت بەرلە بلاوکردنەوەی ژنەکەم بەچاکترین کەیف و سەلیقەوە شیکاری ئەو دێڕەی ئەکردو بیروڕای گونجاوو لەبارو لەڕادەبەدەری بۆ دەربڕیوە...!

"الفونس دودە"نوسەری بەناوبانگی فەرەنسی ترسی ئەوەی لێ نیشتبوو گەربێتو ژن بێنێت ئەبێتە کۆسپ لەبەردەم خەیاڵ و ئەندێشەکانیدا کەچی کاتێ بە " ژولی الار"ئاشنا بوو ئەویندارێ کاری تێکردو ئەو بیرو باوەڕەی پێگۆڕی ، چونکە زۆرینەی شاکارە زیندوەکانی " الفونس دودە"ئەوانەن کەلەدوای زەماوەندکردنەوە نوسیونی ، خاتو "دودە"لەئەدەبیات و ناسینی کەلتورە ئەدەبیەکاندا دەستێکی باڵای هەبوو ئەم ڕستەیەش لەزاری براکەی بەڕێز "الفونس دودە "وە ئەڵێم ، براکەی بەڕێز "الفونس " ئەڵێت :- براکەم هەرگیز شتێکی ئەنوسیوە تاکو ژنەکەی بەزاراوەیەکی جوان ئەیڕزانبێتەوە و بەرگێکی نوێی بەبەردا ئەکردبێت .

"هربرت" سروشت ناسی بەناوبانگ لە توێژینەوەی مێش هەنگدا ڕۆچونێکی تەواوی هەیە، لەتەمەنی ١٧ ساڵیدا نابینا بوو ئەو لەپاش هاوسەرێتی ژنەکەی چاوەکانی خۆی خستە خزمەتی ئەو هێندە بەدڵسۆزییەوە ئەرکەکانی بەئەنجام ئەگەیاند بونەهۆی ناوو شۆرەتی مێردەکەی ، بانەوەش بڵێم کە ژن بێ هەبونی زانیاری پێویست توانایەکی لەباری نییە تابتوانێ کۆمەك بەپیاوەکەی ببەخشێت ، بۆیە پێویستە زانیاری زیاتر وەدەست بێنن تا توانای بەخشینی زیاتریان هەبێت ، تەنانەت ئەگەر پیاو پێویستی بەیارمەتی ژن هەبێت ، هەر هێندەش کەژن بەکارو پێویستیەکانی پیاو ئاشنا بێت بەلێزانانەو لێگەیشتنی زیاترەوە پێکەوە ئەژین بەمشێوەیەش ژن ئەگۆڕێتە سەر شێوەی

هاورێیەکی دڵسۆز پیاویش بەحەزو نیشتیاوە مـەیلی هەڵسـوکەوت وگفتـو گـۆ کردنی لەگەڵدا نەکات و چێژی لێ نەبینێ .

چەند ماوەیەك لەمەوبـەر ئامـادەی بینینـی شـانۆگەریەك بـوم بـەناوی "بومە ئەو ژنەی کە هەموشتێ ئەزانێ "ئەم شانۆگەرییە لەنوسینی "سـر جیمـز بری"کەیەکێك لەو کەسایەتیانەی ڕۆڵی سەرەکیان تێدا ئەبینی بـەناوی خـاتو " وایلی" کاتێ شەودا ئەهات و ئەچویە سـەر جێگـەی نوسـتن کتێبێکـی گـەورەی بەناوی " کۆمەڵی یاسـاکان " لەگەڵ خۆیدا ئەبردە سەر جێگـەی نوسـتن خـاتو " وایلی" کە براکەی لێی ئەپرسی بۆچی ئەم کتێبـە لەگـەڵ خۆتـدا ئەبەیتـە سـەر جێگەی نوستن ئەیوت : - ئامەوێ مێردەکەم شتێك بزانێ کەمن ئەیزانم،

ئاشنا بون بەکاروپیشەی پیاو هێندە لەبەردو پـێش بردنـی کـارو بـاری پیاودا کاریگەرەخاوەن کۆمپانیاو کارگەکان لەهەوڵی ئەوەدان کرێکارە ژنـەکانیان لەکارو باری مێردەکانیـان بـەئاگا بـن و سـەرنجی تەواوی لێبـدەن تایبەتمەنـد و پسپۆڕەکان پێیان وایە ئەگەر ژن بزانێت مێردەکەی چ کارێك ئەکات ناچار کەیف و خۆشی بەکارەکـەی ئـەو دەردەبڕێت،پەیوەنـدی و سـەرنجی ژن لـە کـاری پیـاو سەرنجی بەقازانجی پیاوەکەیەو پاشان قازانجی سەرۆك و خاوەن مایەو کارخانـەکان ، هەندێ لەکارگەکانی شاری "اورلیکون"دواخـوازن لـەکرێکارەکانیان ژنـەکانیان بانگهێشت بکەن تا بەتەواوی شارەزای کاروباری مێردەکانیان بـن ، بەڕێوەبـەرو خاوەنی ئەم کارگانە بڕوای تەواویان بەم تاکە فاکتەرە هەیە تابتوان زەمینەیـەکی لەبارو فراوان بۆ بەرەو باڵابردنی بەرهەمی کارخانەکانیان بڕەخسێنن .لەیـەکێك لەڕۆژنامەکانی ڕۆژنامەی " ژنی ئەمڕۆ " نمونەیەك سەرنجی بەلای خۆیدا ڕاکێشام باسکردنی شتێکی بەکەڵکە :-

جارێــك ژنــی یــەكێك لــەكرێكارەكانی كارخانەیــەك ســەردانی ئــەو كارخانەیە دەكات كەپیاوەكەی كــاری تێــدا دەكــات، ئــەبینێ ئــەوا مێردەكــەی بەهێزی دەست و بازو خەریكی هەڵسوراندنی میلێكــی پــۆڵاینی گەورەیــەو بــەو هۆیەوە مەكینەیەكی گەورەی پێ دەكەوێتە كار ، كاتێ كە مێردەكەی ئەچێتەوە بۆ ماڵ ، ژنەكەی پێشنیاری ئەوەی بۆدەكات كــە هەڵســوڕێنەرو وەگەڕخــەرێكی قاچ لەجیاتی دەست دامەزرێنن باشترە ، پیاوەكە ئەم پێشنیارەی پێ بــاش ئــەبێ وبۆ بەڕیوەبەرو سەرپەرشتیاری كارخانەكەی باس ئەكات ، ئەوانیش سەرنج ئەدەن ئەم بیرۆكەیــە بەكەڵكــەو دەســبەجێ ئەیخەنــە قۆنــاغی جێبــەجێ كردنــەوە بــەو هەمانشێوەیەی كە ژنەكە پێشنیاری كردبوو ، لەئەنجامــدا دەســكەوتی كارخانــە ٢٠٪ بەرەو ژور هەڵكشاو ژن و مێردیش ڕێژەیەكی ئەو سەردەمەی كە بەری دڵی ئەگرت بەبڕی ٣٥٠ دۆلار بۆ ئەو داهێنانە كرایە خەڵاتیان .

بەشێكی گەورەی ژیانی پیاو لەبێداری و كارو پیشەدا بەسەر ئەچێت ، بۆژنیش دەســكەوتێكی گەورەیــە ســەبارەت بــەكاری زیــاتر كاتــە بێدارییــەكانی مێردەكەی زانیاری و ئاشنایی پەیدا بكات ، هەركاتێ كتێبە زیندوەكەی جــەنگ و ئاشتی شاكاری زیندوی‌تولستوی‌ئەبینم دەمو دەست ئەوەم دێتە یــاد ژنەكــەی بەچ ئیشتیایەكەوە حەوت جار پاكنوسی كــردووە ، دەربــارەی تۆلســتی و كتێبــە ئەمرەكەی كە بەیەكێك لەشاكارە مەزنە جیهانیەكان هەژمار ئــەكرێت نوســراوی زۆری لەسەرەو منیش لەیەكێك "بیبلوگرافیا" كاندا خوێندومەتەوە .

نوسەر ئــەڵێت :- ژنەكــەی تۆلســتۆی ئــەم مەیدانــەی بــۆ مێردەكــەی ڕەخساندوە تا ئەسپی خۆی تێدا تاو بدات بەڕاستی ژنەكەی تولستۆی ژنێك بــووە ئەتوانرێ بوترێت باڵی ڕاستی تولستوی بووە .

## ٩... چاك ڕەفتار كردن لەگەڵ هاوكارانی مێردەكانتاندا

زۆرێك لەو خانمانەی كە لەوانەیە ئێوەش هەمان ڕفتاری ئەوان بكەن حەز بەوە ئەكەن شوێنكارو هاوكاری مێردەكانیان بزانن و بناسن...!
گرنگترین پرسیارێك كەبەمێشكی ژناندا دێت ئەوەیە ئەو كەسانەی هاوكاری مێردەكانیانن ئایا جێگەی بڕوان یان ...نە ء...؟
هەڵبەت هەبونی هاوكاری چاك جۆرە نیعمەتێكە باسكردنی كۆتایی نایەت، بەڵام كرۆك و جەوهەری مەسەلەكە لەوەدایە هاوكارانی مێردەكانتان هەرچەندە ژیانی سەربەخۆوكۆمەڵێك تایبەت مەندێتیە لەوانەیە پەیوەندی ڕاستەخۆی بەئێوەو مێردەكانتانەوە نەبێت بەڵام ئەتوانێ چ نرخ و بەهایەكی هەبێت لەژیانە تایبەتیەكەی ئێوەدا ...؟

مۆڵەت بدەن من وەك ژنێك بێ پەردە بڵێم ، گرنگترین خاڵی بنەڕەتی لەناشنا بونی كاری مێرددا زانیارییە لەبارو دۆخی هاوكارەكانیەوە .

هەمیشە خانمان ، بەتایبەت ژنانی ماڵ ناتوانن قایل بن بەوەی نەزانن هاوكاری مێردەكانیان چین و چۆنن ...!
چونكە زۆرینەی كات مێردەكانیان لەگەڵ ئەواندان و كارو باریان بەوان بەڕێوە ئەچێت تەنانەت هەندێكیان پەوەندی و كاریگەری تەواو لەكارەكانیاندا ڕەنگی داوەتەوە ، ئەمەش خۆی بۆخۆی كارێكی ئەستەمە ژنی ماڵەوە قایل بێت بەوەی كەسێكی دیكە جێگەی ئەم بگرێتەوە وهۆكارێك بێت بۆبرەو پێدان و بەخشینی كۆمەك ، هەربۆیە بەردەوام ژن لەو گومانەدائەتلێتەوە هیچ كەسێك لەخودی ئەم چاكترو باشتر نییەو نابێت بۆ مێردەكەی جگە لەخۆی ، بەڵام ئەمە شتێكی چاك نییەو بگرە زیانبەخشیشە .

خانمـانی خۆشەویسـت : گـەر مێردەکانتـان لەچوارچـێوەو سـنورێکدا کارنەکات کۆمەڵێکی زۆر لەهاوکارانی لەگەڵدایە ، هەوڵ بـەن و بیرتـان نەچـێت ئـەو هاوکارانـەش بـەدەر لەسـنوری هەریـەکێکتان بەرپرسـی خێزانێکـەو وەك ئێوەلەماڵێکدایە لەوانەشە هەندێکیان خـاوەنی خێـزان و منـداڵ بـن و دورنییـە هەمان بارو دۆخی ئێوەیان هەبێت کە ئێوە هەتانە لەگەڵ مێردەکانتاندا ، ئەوەش بزانە گەر وانەبی مێردەکەتان ناچارە لەشوێنی کارکردنەکەیدا تـەواوی کارەکـانی بەتـەنها ئـەنجام بـدات ئەمـەش لەبـەرئیرەیی و کورتبینیـەکانی ئێـوە کۆمـەك لەکەسانی تر نەخوازێ .

فەرامۆشی نەکەن :

هاوکاری مێردەکانتان لە وتارو کـرداردا سـەرنجی ئـەو خاڵـە ئـەدات بەویقارە رێزی کەسانی دیکـە کـێش نـەکات ، گـەر ئێـوەش بـەدەربڕینی وشـە کەلێکی ڕقو توانج گفتو گۆی لەگەڵدا بکەن دیارە نەك تـەنها بۆچـونێکی باشـی نابێت لەسەرتان بەڵکو بەژنێکی گێل و گەوجیشتان لەقەڵەم نەدات،ئەوەش بزانن مێردەکانتان لەشوێنکاری خۆیاندا ناچـارن تـەواوی کارەکانیـان بخەنـە ئەسـتۆی خۆیان تەنها لەبەر ئیرەیی و ڕەشبینیـەکانی ئێوە خۆیان لەو هاوکـاری و کۆمەکـە بکێشنەوە .

خانمانی خۆشەویست :

سەرنج بدەن ئەو کەسانە هاوکاری مێردەکانتان ئەکەن هەریـەك پلـەو پایەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە کە بەو هۆیەوە گوزەرانی ژیان و ماڵو خێزانیـانی پێ بەڕێوە ئەبەن و کەسانی نەجیب و خاوەن قەدرو ڕێـزن ، تـۆیش گـەر ژنێکـی هوشـیارو زرنـگ بیـت بەچـاوی ڕێـزەوە تێیـان ئـەڕوانیت تایبـەت مەندیـە پەسەندەکانیان ئەکەنە سەر مەشق و ڕەزامەندی مێردەکانتان وەدەست دێنن .

## هاندانێك بۆ وەدەست هێنانی زانست و دانایی

خانمە خۆشەویستەكان :-

ڕاستگۆیانە وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەنــەوە وهــەوڵی ئــەوە بدەن درۆی تێدا نەكەن ملی خۆتان مەشكێنن و فریو مەخۆن

- ئایا مێردەكەتان خوازیاری گەیشتنە بەپلەو پایەی بەرز...؟
- ئایا مێردەكەتان ئامادەیی وەدەست هێنانی پلەو پایەی تێدایە...؟
- ئایا مێردەكەتان سەبارەت بەزانست و دانایی هاندەرێكی هەیە...؟
- ئایا مێردەكەتان ئامادەیە بۆ وەدەست هێنانی ئەو مافانە...؟

بەڕێزان :

گەر مێردەكانتان ئەمجۆرە ئامادەییانەیان تێدا نییە .. چۆن هاوكــاری ئەكەیت ...؟

كەمتر پیاوانێك ڕێڕەوی كارێك لەبەر ئەگرێت بۆكارو پیشــەیەك دوای پــانزە بیست ساڵێك بەری ڕەنجەكەی بخوات ، یان بەپێناسەیەكی ڕونتر :

كەمتر كەسێك لەئایندەی پیشەو كارەكــەی بەئاگایــە هەرلەیەكــەمین ساتی دەسپێكردنەوە ئەزمونی تەواوی لەگەڵدا خــتبێتە گەڕ...!

یەكێك لە پسپۆڕەكانی زانستی كۆمەڵایەتی بەڕێز (وارنر) بڕوای وایە هــەر تاكێكی ئەمریكی بڕوای بە سەركەوتنی خۆی هەیە، بەڵام یەكێك لە شــێوە هەرە گرنگ و كاریگەرەكان كــە مــرۆڤ ئەگەیەنێتــە ترۆپكــی ئاســودەیی و سەركەوتن بە دوادا چونی زانــست و داناییە، نومێــدە ســەرەتاییەكە كــە لــە بناغەوە بڕوایان پێیەتی و چەندەها كەسی گەیاندۆتە شۆرەت و ناوداری و بە

زيندويى ناويان لە ميژوودا ماونەتەوە ...سەرنج بدە (جۆرج استيونسون) بە شەو نخونى شەوانە بە موتالاّو سەرگەرمى بە زانستى بيركارى و فيزيايى و (لكومستيوى) داهينا

(جيمس وات) لەكاتەكانى پشوداندا سەرگەرمى زانستى بيركارى و كيميايى لەم ريگەيەوە زانيارى خۆى گەياند كە بۆيە هۆى داهينانى دەزگاى (هەلّم)

(چارلز فراست) زاناى بيركاريزانى بە ناوبانگ

رۆژگارى پينە دۆزى و چەرمەسەرى بەرىّ كرد، بەلاّم چونكە هيندە تامەزرۆى زانستى بيركارى بوو، ويراى كارو پيشەكەى، هيندە سەرۆكارى ئەو زانستەى ئەكرد تا گەياندىيە ئەو پايە بەرزە .

(جان هانتر) زاناى بەناوبانگى زانستى نەشتەر گەرى كاريك كە بارى گوزەرانى پىّ نەچوو بەريوە دارتاشى بوو.. ئەو شەيداى فير بوون بوو، كاتە بەتالّەكانى بەفيرۆ نەئەدا، شەوانەتەنها چوار كاتژمير ئەخەوت، پاش چەند موتالاّو ليكۆلّينەوەى زانستى نەشتەرگەرى بەدەستهينا لەم ريگەيەشدا هيندە نەبەرديەكى بىّ وينەى نواند تاكو لەو زانستەدا هيندە رۆچوو كە بويە يەكيك لە دانيشمەندە ناودارەكان

ليرەدا ژن نابيت دورە پەريز لە پياو بگريت، بەلكو پيويستە ياريدە دەربيت بۆ لادانى كۆسپ و لەمپەرەكانى سەر ريى ژيانو ئاسودەيى و ئارامى بۆ خيزان دەستەبەر بكات خۆيشى بۆ خۆى سەرگەرميەك بسازينىّ كە هەست بە تەنهايى نەكات و بە چاوى واقع بينانەوە بروانيتە بارو دۆخەكان چونكە بەختەوەرى خەسلّەتيكى بۆ ماوەيى و زگماكى نييەو پلەو پايەش كەس لە لەدايك بونەوە هاوريى نەبوە، بەلّكو بە هەولّ و بەدواداچوون، ليهاتووى و سەركەوتن دينە گۆرىّ

یەكێك لە و پزیشكانەی ناشنایەتیەكی دێرینم لەگەڵیدا هەیە ئەزانم شەیدای لە رادە بەدەری ئەدەبیاتە . پێی ووتم :

.. من زیاتر لەوەی كە بە نوژداری .. واتە ئەو تایبەتمەندیەی خۆمی تێدا ئەبینمەوە شەیدای ئەدەبیاتی هونەرو وێژەم، وەئەگەر بمەوێت بە ئارەزوەكەم وەڵامی ئەرێ بدەمەوە ئەوكات ئامپەرژێتە سەر لێكۆڵینەوەو بەدواداچونە پزیشكییەكانم هەر بۆیە بۆ لەدەست چوونی ئەو بوارەش زۆر بەداخم بۆ پاراستنی ئەوەی كە ژیانم زامن ئەكات ناچارم ئەوەی كە خواست و ئارەزوم بێت چاو پۆشی لێبكەم .

هاورێكەمان مافی خۆیەتی، چونكە هەمیشە مرۆڤ ناتوانێت چێژ لە خواست و حەزەكان بگرێت و هەندێ كات ناچارە لەزەت و خۆشیەكانی لە پێناوی بەرژەوەندی كارو پیشەكەیدا بەخت بكات.

رێگەی راستی ژیان ئەوەیە كە مرۆڤ شەیدای سەركەوتن و بەرەو پێش چوون خوازیاری ژیانێكی باشتر بێت، نەك هەمیشە زەبون و دەستەو ئەژنۆ لە چوار چێوەیەكی وشكدا قلب بگرێت مرۆڤی راستەقینە هەمیشە ئەبێت واقیع بین و پێشرەو بێت.

(هرویك) لە یەكێك لە كۆمپانیاكانی سوتەمەنیدا دەست بەكار بوو. ئەو پۆستەی لە ئەستۆیدا بوو پۆستێكی بچوك و بێ بایەخ بوو، بەڵام بەلای ئەوەوە كە تازە دەستی بەكار كرد بوو دەسپێكێكی گونجاو بوو

وارێكەوت كۆمپانیا پاش ماوەیەك بە چۆكدا هات و (هرویك) لەو كۆمەڵەكەسانە بوون كە لەكار خران .

(هرویك) بەو ئەزمونە كەم و كورتانەی هەیبوون لە هەوڵی وەدەستهێنانی كارێكی تردا بوو، بەڵام زانیاریەكانی ئەو لە ئاستی نوسەرێكی

سادە تێپەڕی نەنەكردو ئەمەش نەئەبویە هۆی وەدەستهێنانی كارێكی گونجـاو .. ئەو ماوەیەكی زۆر بێكار لەم ئیدارە بۆ ئەو ئیدارە لەم كۆمپانیا بۆ ئەو كارخانـە ئەمسـەرەو سـەری ئەكرد ، بەڵام هەمیشە بەنائومێدی ئەگەڕایەوە، سەرەنجام ناچار بوو لەگەڵ دەستەیەك لەكرێكارەكانی چالاكی چاڵە ئەوتەكانـدا دەسـبەكار بـوو ، لەم كارەدا بەرامبەر هەر كاتژمێرێك بڕی ٤٠ سەنتی وەرئەگرت ئەم بڕە پارەیەش بەر لەبەری پێویستییەكانی بۆجێبـەجێ نەئـەكرد ، هاوسەرەكەیشـی بـۆ زامـن كردنی باری گوزەرانیان لەفرۆشگەیەكدا بوبە فرۆشیار .

ماوەیەك باری گوزەرانیـان بەمشـێوەیە بـوو تاكۆمپانیـای سـوتەمەنی جارێكی دیكە "هرویك"ی بانگهێشت كردەوە سـەركار ، بەڵام ئـەمجارە لەپۆسـتی ژمێریاریداخۆی بینیەوە .

"هرویك"ی لاو بچوكترین زانیاری لەبارەی كاری ژمێریارییەوە نەئەزانی ، پاشماوەی بەسەرهات باڵەزاری خۆیەوە گوێ بیستی ببین...

نەك تەنها رێگەی سەرفەرازیم لەم برسێتییە فێر بـون بـوو ...! ئەبوایـە بەتەواوی فێری كاری ژمێریاری بوبومایە هەربۆیە بەبێ كات بەفیڕۆدان ، لەفێرگە شەوانییەكاندا خۆمم ناونوس كرد، ئێستا ئـەو شـكۆدارییەم هەیـە بەڕاشـكاوانە بڵێم سەرگەرم بونم بەفێربونەوە زرنگترین كارێك بوو تا ئەوكاتە ئەنجامم نەدابوو ، پاشان ئەوەم بۆدەركەوت كەبەسود وەرگرتن لەكاتەكانی دەسـبەتاڵی زەمینەیـەك بۆفێربوون بسازێنم خۆم بكەمە كەسێتییەكی سەركەوتوو تواناى لێهـاتویی خـۆم لەكاری ژمێریاریدا ببینمەوە .

پاش سێ ساڵ خوێندن (دیپلۆم)م لەكاری ژمێریاریدا وەدەست هێناو بـەو هۆیەشەوە مانگانەكـەم دوبەرامبـەر زیـادی كـرد ، وێـڕای ئەمـەش ئـەمجارەیان لەكۆلێژی یاسا خۆمم ناونوس كردو نزیكەی چوار ساڵیش سەرگەرمی ئەوە بـووم

تاکو (لیسانس)م بەدەست هێنا لەکاری بریکاریدا لەم هەل و مەرجەشدا هێشتا هەست دەکەم هەگبەی زانیارییەکانم هەر بەتاڵەو لەوەی ئەیزانم ڕازی نیم بەوتەی خۆرهەڵاتیەکان تازە گەیشتبومە ئەو شوێنەی دەرکم بەنەزانی خۆم کردبوو هەستم ئەکرد هیچ نازانم ........!

هەر لەم دیدگایەشەوە ئەمجارەیان بەرەو (دکتۆرای ژمێریاری) هەنگاوم هەڵگرت، سێ ساڵی خایاند تاکو ئەو بڕوانامەیەشم بەدەست هێناو پاشان بومە (ڕاوێژکاری دادگا) بەڵام پێت وانەبێت لێرەدا ووچانم دابێت، نە.ء.. هەرچەند ئاستی زانیاریم بەرزتر ئەبویەوە شەیداییم بۆ زانیاری بەرەو باڵاتر ئەچوو، بەهەر حاڵ سێ ساڵی دیم زانستی بیرکاری خوێند و پاشان یاساکانی ووتار بێژی وداکۆکی کارلە دادگای گشتی و هەموو ئەمانە کاریگەری تەواویان لە کارو پیشەکانمدا ئەنواند.

(هرویك) لە درێژەی ڕونکردنەوەکەیدا ووتی:-دیارە ئەتەوێ بلێیت لەماوەی دوانزە ساڵی هەوڵ و کۆششمدا چیم دەسگیر بوو ..؟ زۆر چاکە باهەر بە خەملاندنێکی سەرپەنجەیی پێت بلێم ئەو مافە کردارییانەی دەسگیرم بوون نزیکەی هەزارو دوسەد بەرامبەرسەردەمانێك کەکرێکاری ڕاکێشانی بۆریە نەووتەکان بومزەحمەت و ڕەنجێکی زۆری جەستەیشم ئەکێشا

بۆیە بەرێز (هرویك) لە حاڵی حازردا ووتەکانی (دانانی ئەم کتێبە) خاوەنی خانەیەکی بریکاری سەربەخۆیەو سەرگەرمی توێژینەوەی زانیاریەکانی خۆیەتی .. بەسەرهاتی بەڕێز (هرویك) ئەیسەلمێنێ پیاوی شەیداو تامەزرۆی پێشکەوتن بە هاوکاری ژنێکی هۆشمەندو زرنگ ئەتوانێ هەورازوو نشێوی ژیان ببڕێت لە گێژاوی کەساسی و زەبونیەوە بگەیەنێتە پلەی بەرزی کۆمەڵایەتی لێرەدا ئامۆژگاریەکم بۆ خانمانی هۆشمەندو تامەزرۆی پێگەیشتنی مێردەکانیان

خانمی خۆشەویست :

پیاوێك بە درێژایی ڕۆژ لە ئیدارەی کارخانە یان بەڕێوەبەریەکدا یا لە هەر شوێنێکی دیکەدا کار ئەکات، شەوانیش بۆ بەدەستهێنانی زانیاری سەرگەرمی موتالاکردنە .. دیارە هەمیشە ماندووە .. کاتێك ڕوو ئەکاتە ماڵ پێویستە بە ڕوو گەشی و گەرم و گوڕییەوە بەرەو پیری بچن، تاکو ماندویەتی جەستەیی و دەرونی لە گیان دەربچێت

پیاو وەك مۆمێك وەهایە کە لە هەردوو سەرەوە بسوتێ، ژنیش پێویستە بە ویقارو حەکیمانە، کێشەو گرفتە ناقۆڵاکانی ژیانی لەبەر چاو ون بکات.

با ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە سەبارەت بە ژن .. بەتایبەت لە ساڵەکانی سەرەتای هاوسەرێتی یەوە تەنهای و سەردانی کەسوکارو بێ بەش بوون لە خۆشی و شادیەکان

لە یادم ناچێت : ڕۆژێك لەگەڵ مێردەکەمدا چوینە سەردانی مۆزەخانەیەکی ئاژەڵ ناسی مێردەکەم لەو چاودێرەی تایبەتمەندێتی تەواوی لە ژیانی ئەهەنگدا هەبوو پرسی :

ئەگەر جەختێکی زۆر لەخۆت بکەیت لە ماوەی سێ مانگدا هەر شەوەی بۆماوەی سێ کاتژمێر بە هەمو کونو کەلەبەرێکی ژیانی ئەهەنگدا توێژینەوە بکەیت .. ئایا بەتەواوی لەم بوارەدا ئابیتە پسپۆڕ ..؟

لەوەڵامدا ووتی :

بەشەوی سێ کاتژمێر موتالاو لەماوەی سێ مانگدا زانیاریەکی بەرفراوانم لە بارەی ژیانی ئەهەنگەوە بەدەستهێنا، بەڵام ئەگەر ئەم کارەم لە ماوەی شەش مانگدا بکردایە ئەوکات ئەمتوانی لە زانستی ئەهەنگ ناسیدا ببمە پسپۆڕو لەم ڕوانگەیەشەوە هەمیشە ڕۆچونێکی تەواوم هەبێت.

مەبەستم لەم باسەدا وەبیری خستنەوەی ئەو خالانەیە کە لە جیهاندا زەمینەیەکی بەرفراوانی هەیە بۆ موتالاو توێژینەوە، لەوانەیە ئێوە حەزتان لە زانستی نەهەنگ ناسی نەبێت، بەلام لە ڕاستیدا نەهەنگ ناسی زانستێکە هەروەکو هەموو زانستەکانی زیندەوەرزانی

کاتێ مێردەکەتان سەرگەرمی فێربوونێکە ئێوەش لەو کات و ساتە گونجاوەدا هەلی خۆتان بقۆزنەوەو سودمەند بن، ئەگەر وانەکەیت دیارە لە کاری سەرگەرمی مێردەکەتاندا لەمپەڕێك دروست ئەکەنو نیگەرانی بەرۆکتان پێئەگرێت، هەربۆیە لەجیاتی گۆشەنشین بوون و دەستەونەژنۆ دانیشتن خەم و پەژارە خواردن باشترە ئێوەش دوای زانست و زانیاریەك بکەون، چونکە ئێمە لەم ژیانێکدا ئەژین بەرەنجامی هەولّ و ئەندێشەی دانیشمەندان و بیرو ڕای زانایانمان بەئاسانی لەبەر دەستدایەو ئەتوانین بیانکەینە سەرمەشقی خۆمان.

بۆیە ئەو ماندویەتەیان کێشاوە تا زانیاریەکانی خۆیان بگەیەنن بە کەسانی دیکەو تۆیش یەکێکی لەو کەسانە ئەوەش لەیاد نەکەیت کە وەدەستهێنانی زانست و زانیاری تەنها ڕۆشتن نییە بۆ زانکۆکان، بەلّکو بە موتالای ئاسایی‌و خوێندنەوەی کتێب و ئاشنا بوون بە بە بیرو ڕای دانیشمەندان و ناودارانی دونیا ئەتوانی ئەتوانیت ببیتە کەسێکی دانا ئەوەش بزانین پاداشتی ئەمجۆرە ڕەفتارانە کامەرانی ئایندەو سەربەرزی و سەرکەوتنی مالّ و مێردن

با سەرنجێکی چەند نمونەیەکی دیکە بدەین کە کەسانی سەرکەوتووی فێرگە شەوانیەکان لە پاش زەماوەند کێ بوون :

(هربرت هوڤر) یەکێك لە سەرۆکە پێشینەکانی ئەمریکا، ئەو منداڵێکی هەتیو بوو تەنها بە لێهاتووی و شەیدایی خوێندن بوبە گەورە ترین و ناودارترین کەسایەتی ئەمریکا (پل هاڤمن) سەرۆکی دەستەی بالای بەڕێوەبردنی کۆمپانیای

"استود بیکر" ئەو لە قۆناغی بارکێشیەوە خۆی گەیاندە ئەو پلەیە (توماس ویلسن) سەرۆکی دەستەی بالآی بەڕێوەبردنی کۆمپانیا بەرهەم هێنەرەکانی نێو نەتەوەیی ئەو هەفتەی بە دو دۆلار کاری نوسەری ئەکرد، نمونەی ئەم کەسایەتیانەش زۆرن کە لە ڕێگەی فێرگە شەوانیەکانەوە و هاندانی هاوسەرەکانیان گەیشتونەتە ئەو پلە بەرزەی کۆمەلآیەتی .

٤. خانمی خۆشەویست : مێردەکەی تۆش ئەتوانێت بە سود وەرگرتن لە کاتەکانی پشودان و بێکاری هاندان و بەردەوام بونی هاوسەرێکی وەك تۆ ببێتە خاوەنی کەسێتیەکی ناسراو و بەرجەستەو خاوەن پیشەیەکی بەرز ..

پیاوی بەڕێز : هاوسەرتان ئەزانێ تۆ پیاوێکی لێهاتویت و خوازیاری پێگەیەکی کۆمەلآیەتی بەرزیت .. دوای هاندان و سوربونی ئەو هەلە لە دەست خۆت مەدە، ئەو ئامادەیی ئەوەی تێدایە بەرگەی مەحرومیەکانی بگرێت، تۆش ئەسپی کەسایەتی خۆت لەو مەیدانەدا تاو بدە .

دکتۆر (لورنس لاول) یەکێکە لەو سەرۆکە ناسراوانەی تا ئێستاکەش زانکۆی (هاروارد) بە خۆیەوە بینیوە ئەلێت :

تەنها ڕێگەیەك مرۆڤ بە هۆیەوە بتوانێت پەروەردەی مێشك و هۆشی خۆی پێ بکات تەنها تامەزرۆیی ئەوە بۆ فێربون لەوانەیە بە پێشنیارە بەکەلکەکەتان هاوکاری و ڕێنمایی بکەیت و ببیتە کەسێکی ئیلهام بەخش، بەلآم کاریگەرترین و پڕ بەهاترین هۆکرێك کە زەمینە بۆ پیاو خۆش ئەکات هەولّ و تەقالای ڕستەقینەی خۆیەتی بەڕێز (لاون) لە بیروکەکەی خۆی ئەم بەرەنجامەی وەدەست کەوتووە :

" .. هەرکەسێك هێندەی ئەو توێشوەی بۆدەرون و مێشکی خۆی خستوە هەر هێندەش ئەتوانێ لێی سودمەند ببێت.

## ١١...ئامادە بوون بۆ کارەساتی ناقۆلا

زۆرێك لەژنان پێیان وایە تەنها ئەبێ هەر پیاو بەرپرسی ڕوبەڕو بونـەوەی کێشەو گرفتەکان بن و ببنە قەڵغان بۆی ؛ ئەجۆرە کەسانە پێویسـتە دەرك بـەوە بکەن کاتێ چەرخی ڕۆژگار لەگەڕکەوت و گلۆڵـە کەوتۆتـە لێـژی ، ئیـدی پیـاو پێویستییەکی زۆری بە هاوکارێك هەیە تا دوقۆڵی خۆیانی لێ قوتار بکەن ...!
بەڕێز ( أیزنبیرگ)پاش ٢٥ ساڵ خزمەت لەکارگەیەکی جلشۆریدا ؛ بەچۆکدا هات و کارەکەی لەدەست چوو ، پەیداکردنی کار بۆ پیاوێکی پەنجاو ئەوەندە ســاڵەیش کەهیچ هونەرو دەست ڕەنگینییـەکی ئەوتۆنـەزانێ هێنـدە ئاسـان نییـە ، بـەلاَم (ایزنبیرگ)و هاوسەرەکەی لەوجۆرە کەسـانە نەبوون هەروا بەئاسانی مەیـدان چـۆڵ بکەن و بکشێنەوە، ئەوان لەعەوداڵی گـەڕانیان بـەدوی کارێکـدا ڕێیـان کەوتـە دوکانێکی نانەوا خانەو بڕیاری کڕینیان دا بۆکڕینی ئـەو دوکانـەش ناچـار بـوون بەفرۆشتنی هەموو کەلو پەلو پێداویستییەکانی ماڵەوە ، ژنەکـە سـەرنجیدا بـارو دۆخ هێندە لـەبار نییـە تاکرێکارێـك بۆیاریـدەدانی کارەکـەیان بگـرن هەربۆیـە بڕیاریدا خـۆی جێگـەی کرێکارەکـە بۆمێردەکـەی پڕبکاتـەوە و بێتـە هاوکـاری مێردەکەی .

ئەو زۆر بەخۆشـحاڵییەوە ئـامێزی بـۆ هاوکـاری مێردەکـەی گرتـەوە ، ڕۆژانە ماوەی دە کاتژمێری تەواو کاری لەو نانەواخانەیەدا ئـەکرد و کڕیارەکـانی ڕابیی ئەکرد ، ئەبێ ئەوەش بزانیت سەرۆکاری کردنی پڕۆژەیەکی لەجۆرە لەلایـەن

ژنێکەوە کارێکی دژوارە و دژواریەکەیشی لەوەدا بوو نەبوایە پاك و خاوێنی و شۆردنی کەلو پەل و چێشت لێنان و چاودێری ماڵەوەش بکات.
ئەم ژنە بەدرێژایی پێنج ساڵی ڕەبەق بێئەوەی گلەیی و سکاڵایەك بکات، هێندە بە کەیف و خۆشیەوە هاوکاری مێردەکەی ئەکرد و ڕەونەقی ئەبەخشیە کارەکەی بویە هۆی ئەوەی سەرمایەکەیان بگەیەنێتە ئەو ئاستەی ئیدی پرۆژەکەیان بدەنە کرێ و لە حاڵی حازردا کرێکارانێکی زۆریان لە خزمەتدایەو ژیانێکی پڕخۆشی و کامەرانی بەسەر ئەبەن.
لە زاری خانم ( أیزنبیرگ) کە لەم پەیوەندیەدا پێی ووتم :
من بەتەواوی مەیل و نارەزووەوە هاوکاری مێردەکەم کرد تا ئەو لەو فرسەتەی کە هاتبوە پێشی سودمەند ببێت و بتوانێت جارێکی دیکە سەرپێی خۆی بکەوێتەوە، شانازی ئەکەم بەوەی من و مێردەکەم لە سایەی هەوڵ و کۆششەوە توانیمان خۆمان لە دەردەسەری و فەلاکەت و بەدبەختی و هەژاری دەرباز بکەین !..
من بەدرێژایی چەند ساڵ کار ئەزمون گەلێکی فراوانم لە زەمینەی کارو ڕەفتاری خانمانەوە بەدەستهێناوە، ژن گەلێك ئەناسم کە خێزانەکانیان بە گرفتێکی ئاسانتر لە گرفتەکەی ( أیزنبیرگ) دوچار بوە، بەڵام بەهۆی سستی و هاوکاری نەکردن و نائامادەیی ژنەوە لە قوڕی ڕەش چەقیون ..
زۆرێك لە ژنان پێیان وایە تەنها مێرد بەرپرسە لە ڕوبەڕوبونەوەی هەر کێشەیەکدا و ئەبێت هەر ئەو بەلا گەردان و قەزاوە گێڕ بێت.
ئەم جۆرە کەسانە ئەبێت ئەوە بزانن هەرکات چەرخی ژیان لە گەڕ کەوت و گلۆڵە کەوتە لێژی، ئیدی پیاو پێویستی بە هاوکاری ژنە تاکو دوقۆڵی خۆیانی لێ دەرباز بکەن.

نێستا بەسەرهاتی خانمێكی دیكەتان بۆ باس ئەكەم خانم (كلمن)

خانم (كلمن) نەك تەنها هاوكاری كارو پیشەی مێردەكەیەتی، بەڵكو خۆیشی كارو پیشەی هەمیشەیی لە ئەستۆدایەو لەو ڕێگەیەشەوە هاوسەنگی ئابوری لە دارایی خێزانەكەیدا ڕەنگی داوەتەوە.

(هلن كلمن) پەرستارێكی پسپۆڕەو كاتێك لەگەڵ (بیل)دا زەماوەندی كرد، ئەو بڕوانامەیەكی ئەوتۆی نەبوو، نەچویە فێرگە شەوانیەكان بەڵكو (دیپلۆم)یەك بەدەست بێنێ (هلن) لەبەر ئەوەی مێردەكەی خاتر جەم بێو بە خەیاڵی ئاسودەوە درێژە بە خوێندنە شەوانیەكەی بدات، ئەویش چاكتر درێژە بە كاری پەرستاریەكەی ئەدا كەیف و زەوقی بەرفراوانی ئەم ژنە هێندە كاریگەریەكی بەرچاوی ئەنواند، تەنانەت لە كاتی دوگیانیداو شەوی مناڵ بونەكەشی كە مێردەكەی گەیاندیە ئەخۆشخانەی مناڵ بوون لەو شەوەدا جەختی لەسەر ئەوە ئەكردەوە كە ئەبێت ئەمشەو لە فێرگەكەی دوانەكەوێت ئامادەیی هەبێت و خەمی هیچ شتێ نەخوات ..

(بیل) هەرگیز لە فێرگە دوانەدەكەوت و پاش شەش ساڵ بەردەوامی بڕوانامەی (دیپلۆم) ی بەدەستهێنا، پاش بەدەستهێنانی ئەو بڕوانامەیەش..بە ئامادەبوونی دایك و خوشكەكەی و ژنەكەی ئاهەنگێكی گچكەیان گێڕا بەو بۆنەیەوە ، ئامادە بوان بەخۆشەویستی و ڕێزەوە سەری ئەوازشیان بۆ دانەواند، چونكە ئەو ئەركە لەئەستۆی ئەو ژنەدا بوبویە مایەی سەرفرازی و شانازی .

"بیل" پاش تەواو كردنی خوێندن لەكارگەیەكی دروستكردنی زەرفی دژە ئاگری چێشتخانەدا كاری دەكرد ، سەرەنجام ژنەكەیشی لەمكارەیدا هاوكاری كردو بۆ ما وەیەك دەستی لەكاری پەرستاری كێشایەوە تا بەتەواوی بتوانن ئەوكارە بۆخۆیان قۆرخ بكەن ، لەو ڕۆژانەی "بیل" دەسبەكار بوو بۆ فرۆشتنی

زەفە دژە ئاگرەکان ژنەکەی بە دیار چاو خەڵکییەوە سەرگەرمی دروستکردنی خۆراکی ئەو جۆرەکارە بوو تابیسەلمێنێ ئەو زەرفانەی ئەمان هەیانە بەرگەی ئاگر نەگرن و ناسوتێن...!

ئیدی دوای ماوەیەك باوکی "بیل" کۆچی دوایی کرد ؛ باوکی "بیل" لەگەڵ براکەیدا چاپخانەیەکی گچکەیان هەبوو پاش مردنی باوکی، براکەی هاتە سەر فرۆشتنی ئەو چاپخانەیە ، بیل و ژنەکەی کەوتنە ڕاوێژکردن و بڕیاردانی کڕینەوەی ئەو چاپخانەیە ؛ بەڵام بۆ ئەو مەبەستە ئەوان پارەی تەواویان نەبوو ، بۆیە بڕی پێویست پارەیان لەبانکدا بەقەرزڕاکێشاوچاپخانەکەیان پێکڕی ئەمجارەیان قەرزار بوون ..!

"هلن"جارێکی دیکە چاکی لێکردەوە بەلاداو دەستی کردەوە بەکاری پەرستاری ؛ ئەو شەوان و ڕۆژە پشوەکانی یاریدەی مێردەکەی ئەدا لەچاپخانەدا تاکو هەموو قەرزەکانی بانکیان پێبژاردەوە دەرگای ژیانێکی پڕخۆشی و کامەرانییان خستە سەر پشت .

"هلن" لەنامەیەکدا بۆی نوسیوم :-

دوای پێنج ساڵ سەرنجمدا قەرزەکانی بانکمان سەرلەبەر بژاردەوە قەرزی ئەو خانوەشی تێیدا بووین ئەویشمان تەواو کرد ، زۆر شادو کامەرانم ئەتوانم بەئاسودەیی دانیشم و بیر بکەمەوە لەڕۆژانی ڕابردوو ؛ ئیدی بەئاسودەیی و ئارامی لەماڵەوە دائەنیشم و چاودێری ماڵ و مناڵ و مێردەکەم ئەکەم .

خانمان "ئازنبیرگ و هلن کلمن " نمونەی زیندو بەرچاوی ئەو جۆرە ژنانەن کە لە بەرەو پێش بردن و سەرخستن و کۆمەك و هاندانی مێردەکانیان هیچ جۆرە درێغییەکیان نەکردووە ، ئەوان سەردەمانێك ئاسودەیی و ئارامی خۆیانیان لەپێناوی ئایندەیەکی گەشدا بەخت کردووە، هەرچەند سەردەمانی کۆمەك و

هاوکاری کردن سزا بارو ناجۆرە بەڵام، شوێنەواری درەوشاوەی لە چارەنوسی ئایندەدا بەزەقی خۆی نمایش دەکات لەخێزاندا ، ماڵوێرانی ، نەداری، بێکاری پیاو ، قەرزاری ، مردن ، ...هتدڕوداو گەلی چاوەڕوان نەکراوون و داوێنگیر ئەبن و زۆریش پێویستە ژنیش هاوشێوەی پیاو ڕوبەڕویان ببێتەوە.

من خۆم ژنێك ئەناسم کاتێ دوچاری ڕوداوە چاوەڕوان نەکراوەکان ئەبو ڕوبەڕوی ئەبویەوە هێندە بەگیانی لەخۆبوردەییەوە مامەڵەی لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا ئەکرد کاردانەوەکانی ئەو تەواو چارەنوسی ئەندامانی خێزانەکەی هێنایەگرین .

بەڕێز "استرن"چەندین ساڵ سەرگەرمی کاری فرۆشیاری بوو پاش ماوەیەك ڕوبەڕوی سستییەك بویەوە کەتوانای کارکردنی چەند کاتژمێرێکی ئەبوو لەڕۆژێکدا ، ژنەکەیشی بەپێنج منالەوە نەینەتوانی خۆی لەقەرەو بەرەی هەیچ جۆرە کارێك بدات . خاتو"استرن"بیری لەنمایش کردنی هونەرەکانی خۆی کردەوە ، ئەو پێی وابو ئەتوانێ لەمەیدانی دەستڕەنگینیدا کارێکی لێبوەشێتەوە ، ئەویش بەدروستکردنی کێکی تایبەت بە مەراسیمی بۆنەی لەدایك بوون و زەماوەندەکاندا سەرو ساختەیەکی چاکی هەیە ، چونکە زۆر جار ئاشناو هاوڕێکانی دواخواز بوون مێزەکانی میواندارییان بەو سەلیقە زەوقە ناسکەی خۆی بۆیان برازێنێتەوە بۆ بۆنەو ئاهەنگەکانیان ، ئیدی خاتو "استرن"دوای ئەخۆش کەوتنی مێردەکەی بەدۆست و ئاشنایانی ڕاگەیاند کە ئامادەیە بۆ دروستکردنی کێك و بابەتی شیرینی بۆنەو ئاهەنگەکان و میوانداری و مەراسیمە تایبەتەکان ، ئەمەش وێڕای ئەوەی لەسەلیقەو دەستڕنگینیەکەی ئاگادار بوون ، ئەوانیش خۆشحاڵی خۆیانیان بۆدەربڕی، ئیدی وەستایی و لێزانی خاتو"استرن" هێندە دەنگی دایەوە بویە کلیلی کردنەوەو ڕەها کردنی مەینەتیەکانیان .

لەحاڵی حازردا خاتو "استرن " بەناوی ڕاوێژكاری میوانداری لەمیدیاكان و كەناڵە تەلەفزیونیەكاندا بەرنامەی تایبەتی خۆراكی هەیە ، كارگەی شیرینی و ئامادەكردنی خۆراكی ئەو كرێكارو وەستای تایبەتیان لەخۆ گرتووە ، سەرەڕای ئەمانەش خۆی لەكارگەی پیشە سازییە خۆراكییەكاندا ڕۆڵی تایبەت و گرنگ ئەبینێت .

ئەو بەلێهاتویی و داهێنان لەكارەكەیدا كارێكی وایكرد هەمو شتێ بەخواستی خۆی بێت ، لەبری ئەوەی مێردەكەی كرێكاری كەسانی دیكە بێت ئێستا پۆستی بەڕێوە بردن و ئیدارەی كارگەی لەئەستۆدایە .

خانم"استرن" ئەڵێت:-

من تواناو حەوسەڵەی ژماردن و ئاماری كڕین و فرۆش و خەرج كردن ووردەردەكاریم نییە ، حەزو خواستم ئەوەیە تەنها لەدروستكردنی خۆراكی بێوێنەدا دەسبەكار بم ، سوپاسی بێپایانی مێردەكەشم ئەكەم كارو باری دارایی وردەكارییەكانی لەئەستۆ گرتووە .

هیچ ژنێك نازانێ چ ڕێكەوت و پێشهاتێك بەرۆكی پیاوەكەی ئەگرێت و ئەیخاتە مەترسییەوە ، بەلاّم زۆر جار وارێدەكەوێت ژن ناچار ئەبێت زامنی تەواو یان بەشێك لەقەیرانەكانی خێزانەكەی بگرێتە ئەستۆ.

هەربۆیە لێرەدا ئەڵێم :-

پێرستی ئەو كارو هونەرانەی شایانی نمایش كردنن ئامادەی بكەن تابزانن بۆ ڕوبەڕوبونەوەو ململانێی ڕوداوو كارەساتی ناقۆڵا دەست ئەدات یان نا...؟

ئەگەر خوانەكردە هونەر یان لێهاتوییەك تێتدا ڕەنگی نەداوەتەوە ئەوا خۆت ئامادەی فێر بونیان بكە ...

## ١٢.... ژن و مێردی بەختەوەرو گەشت كردن

ئەو ژنانە توانای چاوپۆشی كردنیان نییە لەو شوێن و ڕێگەیەی كە تێیدا پێگەیون و پەروەردە بوون یان سەردەمانی منداڵییان تێدا بەسەر بردووە ، مێردەكانیشیان لەتەنها یەك جێگەو كاردا كۆت و زنجیر ئەكەن .

"الیوت"بەڕێوەبەری گشتی پاڵاوگەكانی ئەتلانتیك لە فیلا دلفیا بەمجۆرە ژنانە ئەڵێت : ئەمانە هەروەك منداڵی گڕو گاڵ كەروان ...! ئەو پێی وایە ئەمجۆرە ژنانە كۆسپ و لەمپەری ڕێگەكانی گەشەو پێشكەوتنن ، یەكێكی دیكە لەو بەڕێوەبەرانە كە ئەزموونێكی زۆرو زەوەندی لەوبوارەدا هەیە پێی ووتم :-

(... یەكێ لەكارمەندەكانم ،كاتێ پلەی بەرزكرایەوە ، مانگانەكەیشی بەرزتر، كەچی كابرا لەجیاتی

دەربڕینی خۆشحاڵی چاوپۆشی لەو بەرزكردنەوەیەكردو بەداخیشەوە دەستی لێكێشایەوە ، ئەمەش لەبەر ئەوەی ژنەكەی نەیئەتوانی غوربەتی دایك و باوك و كەسو كارو دۆستەكانی بكێشێت تەنانەت ئەو ئارایشتگایەی كە هەرلەكۆنەوە ئاشنای بووە بەجێی بهێڵێت ، دیارە زۆر دژوارە كە مرۆڤ لەخانو بەرەو ئەو ماڵ و ژیانە هۆگری بووە چاو پۆشی بكات و بچێتە گەڕەك و شوێنێكی نەدیوو نامۆوە، بەڵام ئەوەش لەیادنەكەیت

***هاوسەرداری واتە : ئەو پەیوەندییەی كە ئەبێ نیوەی حەزو خواست و ئارەزووەكانی خۆتی تێدا لەدەست بدەیت ، واتە دۆڕاندنی ٥٠٪ و پەیوەندی ١٠٠٪ لە تێهەڵچوونی ژیانی كەسێكی دیكەدا ببەستیت ،***

*چونکە کەسێك دەکەیتە هاوسەری ژیانت پێویستە لەهەمو چاکی و خراپیەکانیدا بەهاوبەشی ژیانی دابنێیت ...*

لەئامارێکی سەردەمی جەنگدا بەنزیکەیی هاتووە .... لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا زۆرێك لەهاوسەرێتیەکان توشی ئیفلیجی بوون و بونە هۆی بچڕاندن و جودا بوونەوە ، ئەمەش بەهۆی ئەوەی ژنەکانیان توانای ئەوەیان نەبوو لەگەڵ مێردەکانیاندا بچنە ئۆردوگا سەربازییەکان و لەگەڵیاندا بژین ، چونکە ئەو ژنانە ورەی چاوەڕوانی و چەشتنی تاڵی و سوێریەکانی ژیانی ئۆردوگاکانیان لەبارەدا نەبوو ...

لەیادی نەکەیت ... ژنی گونجاو ئەو ژنەیە ببێتە هۆی بەختەوەری خۆیو خێزانەکەی .

خاتو "کاشنز"نمونەیەکی بەپێزی مەبەستەکەمە ئەو لەگۆڤاری (ڕۆژی ژند) ا ئەڵێت :

(... دوساڵ بەر لەئێستا مێردەکەمیان بۆ خزمەتی سەربازی هێزە دەریاییەکان بانگهێشت کرد ، ئیدی من کەوتمە ئەو ماڵ و کەلو پەلانەی کەبەهەزار زەحمەت و دەردە سەری پێکەوەمان نا بوو ، گەڕان بەسەرتا سەری وڵاتداو مناڵێکی بچوك ئازارێکی زۆریان ئەدام ، من پێم وابوو ئەمە ناهەموارترین بارو دۆخێك بوو کەبەرۆکی پێگرتبوین بەیەکێك لە ڕوداوە دڵتەزێنەکان لەقەڵەم ئەدا، ئەودوساڵە ئەبوایە بەگەڕان و بێهودەییەوە بەسەربچوایەو بەرگە گرتنیشی کێویکی زۆر سەخت بوو لەسەر شانم ، وردە وردە کەوتمە جمو جوڵو بزوام و پێشوازیم لەئەهامەتیەکان کرد ، ئێستا پاش گوزەراندنی ئەو بارو دۆخە بەناخمدا شۆڕئەبەمەوەو ئەبینم ئەورۆژانە چ بیرو ئەندێشەیەکی مناڵانە بەرۆکیان پێگرتبووم و بۆچونەکانم تا چرادەیەك پرو پووچ بوون ، شتێکی ئەوتۆی ئەمابوو بۆتەواو

بونی خزمەتی سەربازی مێردەکەم کەبەیەکجاری گەڕاینەوە بۆ شارو زێدی خۆمان ، بەڵام بوێرانە پێتان ئەڵێم خوازیارم ئەو سەردەمە دورو درێژتربوایە ، چونکە هێندە چێژم لێبینیوە پڕبەدڵ حەز بەدوبارە بونەوەی ئەکەم ئەو ماوەی دوساڵە پەندو ئامۆژگارییەکی بەسودی دامێ کەزۆر سوپاسگوزار بم چونکە بویە هۆی ڕاستکردنەوەی ئەزمونە خوارو خێچەکانی ژیانم و فێری ئەوەی کردم لەنێو هۆزە جۆراو جۆرەکاندا چۆن هەڵسوکەوت و مامەڵە بکەم و ئارامگری و لەخۆبوردەییم تێدا گەشەی سەندو بەشداریم لەگرفت و کێشەکانی کۆمەڵدا و خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیانی هاوسەرداری کردم ، بەڕاستی بۆم دەرکەوت زامنکەری خۆشی بەختەوەری ژیانی خێزان تەنها سامان و کەلو پەل و ماڵی دنیا نییە ، بەڵکو خۆشبەختی و کامەرانی بەرەنجامی گونجاندن و سۆزی نێوان ژن و پیاوە .

ئەگەر ئێوەش دورکەوتنەوە لەشارو زێدی خۆتان بەگرفت و کێشەیەکی ئەزانن ، ئەوا بۆ خۆسازدان و ڕوبەڕو بونەوە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی لای خوارەوە بکەن:

**یەکەم :-**

هەرگیز پێتان وانەبێت ئەو شوێن و جێگە تازەیەی تێی دەچن کوت و مت لەو شوێن و جێگەیە بچێت کە ئالودەی بون و دەقتان پێوەی گرتووە . هەروەك چۆن مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتریدا جیاوازی ئاوەکی و ڕەگەزییان هەیە لەڕوکەشیشدا هەمویان چون یەك نین دیارە هەرشارو هەر کارێکیش تایبەت مەندیتی خۆی هەڵگرتووە ، خۆ ئەگەر کارو پیشە تازەکەی مێردەکەت هێندەی کارو پیشە کۆنەکەی خۆی بەهاو بایەخێکی ئەوتۆی نییە هەرگیز نائومێدو نیگەران مەبە

چـــونکە زۆرکـــارو پیشـــەی وا هەیـــە بـــەرەنجام و دەســـکەوتەکەی لەدوایـــدا دەردەکەوێ....

**دووەم:-**

هەرگیز بوار مەدە ئەو کەلو پەلو هۆکارانەی ئـالودەی بـوون و خووتـان پێوە گرتوون بـە بـەجێ هێشـتن و دورکەوتنـەوەو نـەمانیان دڵتـەنگ و خەمۆکتان بکەن ...

گەر لەناخەوە خۆت بەلاواز ئەبینیت زۆر بەسەرسـامیەوە ئـەبینیت ئـەو هۆکارو کەلو پەلانە دەقتان لەگەڵیاندا گرتبوو هێندە کارگەر نین ئەمەش ئەوەتان بۆ ئەسەلمێنێت :

هاوین بوو .....

مێردەکەم لەزانکۆی "وایو مینگ" ئەبوایـە وانـەی بوتایەتـەوە ، لـەو سەردەمەشدا خانوی نیشتەجێ بون و کرێ بەو ئاسانیە چنگ نەدەکەوت ، ئێمـە ناچار بوین لەیەکێ لەماڵۆچکەکانی سەربازگەکانداکە هیچ جۆرە پێداویسـتیەکی گوزەرانی تێدا نەبوو گوزەران بکەین بادان بەوەشدا بنێم مـن خودی خۆم ئەو مـاڵ و گەڕەك و جێگەیەم بەهیچ جۆرێ پێ خۆش نەبووبەلام ڕێکەوتی نیشتەجێ بونمان لەو شوێنە بەیەکێ لەسەردەمە پڕبەهاو نرخەکانی ژیان هەژمار دەکرێت .لەوێـدا گوزەراندنی ژیان زۆر ئاسان و سادە بوو ، دراوسێکانمان کەسـانێك بـوون شـایانی ستایش کردن بوون ، کاتێ ژن ومێردە لاوەکانم ئەبینی بەرەو فێرگە ئەکەوتنە ڕێ و چاودیری ماڵ و منالیان ئـەکرێت . منـیش لای خۆمـەوە شـادمانیی ئـاوێزانم ئەبوو لەو خەم و پەژارەو پەستیەی یەکجارم شەرمەزار ئـەبووم ، لـەو هاوینـەدا هاوڕێی زۆر چاکو بەکەڵکم بۆ پەیدا بـون بـۆم دەرکـەوت پلـەو پایـە لـە ژیانـدا

رۆڵێکی ئەوتۆ بۆ دابین کردنی بەختەوەری نابینن ، کەواتە کامەرانی و بەختەوەری کەسانی جۆراو جۆرە بۆتە هۆی گوزەرانی باری ژیاندنیان .

**سێیەم :-**

بەرلەوەی کارو پیشەی تازەو گۆڕانکاری جێگەو شوێن ببێتە کارە ساتێکی کتوپڕ پێشتر خۆتی بۆ ئامادە بکەو خۆت تاقی بکەرەوە .

ئاشنایەکی خۆم لەگەڵ مێردەکەیدا چوونە شارۆچکەیەکی پیشەسازی ،کاری مێردەکەی لەوشوێنەدا ئەبوە هۆی دەرامەتێکی زۆرترو پلەیەکی بەرزتر کە چەندین ساڵ بوو پیاوەکەی بەئاواتەوە هەوڵی بۆ ئەدا ، کەچی خانم لەوێ دوای بیست و چوار کاتژمێر جل و جانتای پێچایەوە و بەرەو شارەکەی خۆی بەڕێکەوتەوە ، پیاوەی بەدبەختیش سەرنجیدا ، بۆ ڕیش هاتووە کەچی ئەبێ سمێڵیش بخاتە بان ، ئەودەرامەت و پارە زیاترەی لێرە وەدەستی دێنێ ناچارە خەرجی دو ماڵی لێدابین بکات...!

ئیدی پاشەکشەی کردەوە بۆ سەرکارو پیشە کۆنەکەی خۆی و ناچار بوو دەرامەتی زیاترو کاری باشتر وەلا نێ و لەبەر خاتری ئەوەی خانم ئامادەی ئەوە ئەبوو لەو بارو دۆخە تازەیەدا خۆی بگونجێنێ و خۆی تاقی بکاتەوە کە ئاشنا بوون بەخەڵکی ئەو شوێنە و شوێنانی تر چەند شتێکی ئاسانە ...

**چوارەم :-**

لەبەر ئەوەی لاف بەو ئازو نیعمەتانەوە لێبدەیت هەوڵی ئەوە بدە هەلی نوێ بقۆزیتەوە :

کاتێ ناچاریت لەناوچەو شوێنێکی نەدیوو نەناسدا نامۆیی بکەیت، هەوڵبدە دۆست و ناشنای نوێ پەیدا بکەیت و خۆت بەتەنیاو بێکەس نەزانیت ؛ لەبری ئەوەی گلەیی و سکاڵا بکەیت بارو دۆخ ڕوو لەتۆ نییە بەمەیل و خواستی تۆ نەهاتۆتە گۆڕێ ، هەوڵ بدە خۆتی لەتەکدا بساچێنە ، حاڵەتەکە بکەرە مایەی ڕەزامەندی و مەیل و ئارەزوت .

خاتو "واتسون"یەکێکی دیکەیە لەو ئافرەتە بەتواناو خۆڕاگرانەی لەگەڵ مێردەکەیدا شانبەشانی ئەو بەشداری هەوڵ و ڕەنجەکانی کردووە ؛ ئەو مێردەکەی لەکۆمپانیایەکی گەورەی سوتەمەنیدا کاری ئەکرد ، ئەو لەگەڵ مێردەکەیو چوار منالّدا لەدەشتەکی ترین و دورترین خاڵی دنیا گوزەرانی ئەکرد، ئەوان لەهەموو تاڵی ومەینەتی و خۆشییەکاندا هاوبەشی یەکتری بوون .

خاتو "واتسون" پێی وایە نیشتمان پێکهاتەی هەست و سۆزەکانی دەروغانەو ئەڵێت:-

**(... من هێندەی چاو ترکاندنێك تەواوی کەلو پەلەکانی ناومالّم پێچایەوە ئامادەی سەفەرکردن بووم لەگەڵ مێردەکەمدا،خۆم و خێزانەکەم بۆمان دەرکەوتووە کەلەهەر شوێنێکی دنیادا خۆشی و ئارامی و پەروەرشی جەستەیی و دەرونی هەیە تەنها مرۆڤ ئەبێ بەدویاندا عەوداڵ بێت ؛ بۆ نمونە .. کاتێ چوینە دورگەی "باهاماس"لەکوبا بینیمان پسپۆڕیکی بواری مەلەوانی وانەی فێربوون و مەشقی مەلەکردن ئەڵێتەوە ، ئەمەش بوبە هەلێکی گونجاو بۆ "سوزان " ی کچەگەورەمان لەلایەن پسپۆڕێکی لێزانەوە فێری مەلەکردن ببێت ، بەفێربوون و مەشق کچەکەم شارەزاییەکی ئیکجار باشی وەدەست هێنا تا ئێستا چەندین خەلاّت و مەدالیای سەرکەوتنی پێشبڕکێکانی مەلەوانی بڕیوە ، ئەمەش**

لەحاڵێکادا گەر ئێمە نەچوینایەتە ئەو دورگەیە هەرگیز ئەو شـۆرەت و شـانازییە نەئەبوە چارەنوسی کچەکەم .

چاکترین رێگەی ژیان لەوڵاتێك یا لەگـەڕکێکی نـەدیوو نـەناس ئەوەیـە لەبری نیگەرانی و پەژارەو خەمخواردن بۆ ئەو شتانەی لەدەستمان ئەچن ، هـەوڵی ئەوە بدەین تا لەو هەلو فرسەتانە لەنیشتمانی خۆمانـدا نەشـازو تـاکن سـودیان لێوەرگرین ، هەر بەم پێو دانگەش ئەگەر کـارو پیشـەی مێردەکـەتان پێویسـتی بـەگۆڕینی شـوێن و جێگـەو وڵات هـەبوو ، پێویسـتە بەسـینەیەکی فراوانـەوە پێشوازی لێبکرێت بەم چوار رێسایە :

١. چـاوەڕوانی ئـەوە مەکـە ، بـارودۆخی تـازە لەگـەڵ بارودۆخـە دەق پێوەگرتوەکەت وێك بچن .

٢. مۆڵەت مەدە بەلەدەست چونی ئەوانـەی لەگەڵیانـدا هـۆگرن ببنـە هـۆی پەژارەو نیگەرانی ، ئەوانە بەئەندازەی ئەوەی بیری لێئەکەنەوە گرنگیان نییە..

٣. بەرلەوەی هەست بەوە بکەیت بارودۆخی تازە بەدڵی ئێوە نییـە ، چـەند مانگێك لەتاقیکردنەوەدا خۆت ببینەرەوە.

٤. لەو هەلە زێڕینانەی بۆت هەڵئەکەون سود مەند ببەو هەرگیز بۆ ئەوانەی بـەجێت هێشـتوون خـەم و پـەژارە مـەخۆ بـۆ ئـەوەی ڕابـردووە ، چ ئەنگییەکی تێدایە گەر مرۆڤ هەمو شوێنێکی دنیـا ببینێـت بەهـەمو جۆرە ژیان و کەسانێك ئاشنا ببێت ...؟

کۆنەپەرستی لەڕادەبەدەر بەنەریت و خور خدەی ژیانی بـاوو باپیرانـەوە لەژیاندا بایەخێکی ئەو تۆیان نییە .

## ١٢.... ئەرکی ژن

ـەورۆژانە مێرەەکـەی مـانووەو لەڕادەبـەدەر کاردەکاتبەرگـەگرتنی هەلومەرجـە ...ـەکان لەئەستۆی پیاودایەو بەرەنجامەکەیشی بۆژنە.

بەر لە چەند مانگێك یەکێ لەدۆستەکانم هات بۆ دیدەنیم ، زۆر شەکەت ...ندوو بەرچاو ئەکەوت ، پاش چەند خولەکێك هەواڵپرسی و بەخێرهاتن هـۆی ... و بونەکەی بەمشێوەیە هەڵڕشت :

(... بڕوا بکە تەواو بڕستم لێبڕاوە ، نزیکـەی شـەش مانگێـك ئـەبێت لەبەر فراوان بوونی کۆمپانیا لەهەوڵی دامەزراندنی پـۆلێکی نوێـدام ، هەربۆیە ناچارم شەوانە تادرەنگێـك بمێنمـەوە و زیـاتر کـار بکـەم تـا ئەمکارە قورسەم کۆتایی پێنەنەیەت ناچارم شەوان درەنگ بگەڕێمـەوە ماڵ ، هەرلەبەر ئەمەشە ئەبێ ئێـواران ژنەکـەم بەتـەنیا نـانی ئێـوارە بخوات چونکە من کاتی ئەوەم نیە بچـمە سـەردانی کـەس و کەسـیش بانگهێشت بکەم ، هێندە نائاسـودەیەو نیگـەرانی دەرئـەبڕێت هیچـی نەماوە دەسبەرداری کارەکەم ببم و پێشـوازی لەزیانەکانیشـی بکـەم ، هەرچی بەژنەکەم ئەڵێم هەلو مەرجی تایبەت ناچاری کردووم،بەڵام لای ئەو جێگەی بڕوا نییە ،منیش هێندە خەیاڵم پرژو بڵاوە هەسـت ئەکـەم ورەو توانای کارکردنم لەدەست داوە.

ئـەم پیـاوەی سـاڵانێکە ناشـنایەتیم لەگەڵیـدا هەیـە لـەدەربڕینی ئـەم ئەندێشانەی سەرم سوڕما ...!چونکە زۆرجـار ئـەوم بەنمونـەی کەسـانی مانـدوو

ئەناس و كارزان بۆ كەسانی دیكەباسدەكر د ... ئێستا نازانم چی بوو لەبەر چەند كاتژمێرێ زیادەی كاركردن هەستی بەم نائومێدییە دەكرد ... بەڕاستی من بەلامەوە سەیرە ...!

من پێم وایە فشاری كاركردن لەلایەك و ، پەرژو بڵاوی دیدو بۆچون لەلایەكی دیكەوە كەمەری چەماندبوو ، بەسەرهاتی ئەم پیاوەم كاتێ وەیاد هاتەوە كە مێردەكەم "دیلكارنگی"سەرگەرمی نوسینی كتێبێكی تازە بوو لەبابەت یاساكانی هاوڕێ گرتنەوە ، دیل ..... بەوەی سەرقاڵی كاری دەرەوەش بوو من هەستم بەئەندێشەكانی ئەكرد ئەو هەرلەبەیانییەوە تا ساتەكانی نیوە شەولەژوری كاركردندا سەرگەرمی كار بوو زۆر بەگەرمی موتالای ئەكرد یادداشتی ئەكردو پێنوسی هەڵئەسوڕاند، لەو ماوەیەشی كە "دیل" كاری تێدا ئەكرد ئیدی هامشۆو ڕەوتمان لەگەڵ دۆست و ئاشنایاندا بچڕاند، ئەمان ئەتوانی دیدەنیان بكەین یان پێشوازی لەمیوانداریيان بكەین ، لەسەرەتادا من لەو تەنیاییە گەلێك بێزار بووم ؛ بەڵام وردە وردە خۆمم بەو شتانەوە خەریك كرد كەحەزم لێئەكردن ؛ لەسەرەتاوە بومە ئەندامێك لەچەند ئەنجومەنێكی خەیریدا ، كاتەكانی بەتاڵیم لەگەڵ دۆستەكانمدا بەسەر ئەبرد ؛ ئەوكاتانەشی كەلەماڵەوە بووم لەگەڵ ئیش و كارو ئامادەكردنی خواردەمەنی و پەرستاری و گەمە كردن لەگەڵ منداڵەكاندا شەوانیشم بەموتالاكردن ئەبردە سەر .

چەند ماوەیەك ڕابوردو منیش لەگەل ئەو بارو دۆخەدا خۆمم گونجاند ، كاری "دیل" یش بەشێوەیەكی موعجیزە ئاسا هاتە بەرهەم ، ئەو كارەی ئەو زوتر لەوەی من بیرم لێئەكردەوە بەسەركەتویی هاتە كۆتایی و ژیانمان جارێكی دیكەش ئاسایی بویەوە .

بۆ ژنان گەلێك دژوارە هەست بەوە بکات مێردەکەی تاچ ئەندازەیەك لەگەڵ کارەکەیدا ڕۆچووە ، جگە لەوەی لەبەردەستیدایە لەناستی هەموو شتێك کوێرو کەرە لەو هەوڵ و کۆششەی مێردەکەی شادمانی و چێژێك نابینێ ، بەڵام ژنی هۆشمەند و زرنگ وێنەی پەرستارێك بەدەوری مێردەکەیەوە سەرگەرمی دڵسۆزی و چاودێری کردنیەتی ، بەڕوی گەش و لێوی خەندانەوە دڵنیایی پێ ببەخشێت و بیگەیەنێتە ئەوەی ئەویش لە دودڵی و گوماندا نەتلێتەوە ئەوەشی بۆ دوپاتِ بکاتەوە ئەو کارەی ئەو سەرگەرمیەتی ئەمیش بەهەمانشێوە تاکو ئەویش بەهەست و سۆز و ماندو بونێکی کەمترەوە کارەکەی بگەیەنێتە ئەنجام .

لێرەدا چەند یاسایە کە خودی خۆم تاقیم کردونەتەوە کەڵکی زۆرم لێوەرگرتوون دڵنیاشم ئێوە لێی بەهرەمەند ئەبن :

**یەکەم :**

هەوڵبدە ئەو خۆراکەی بۆ مێردەکەتی ئامادە ئەکەیت لەگەڵ کارە قورسەکەی ئەودا بگونجێت ، ڕۆژانە چەند جارێك و بەڕێژەیەکی کەم خواردنی بۆ ئامادە بکە ، ئەگەر نابەدڵ و پەلە نان ئەخوات تاکاتەکانی نیوە شەو کار ئەکات خۆراکی سوك و توانا بەخشی بۆ ئامادە بکە .

**دووەم :**

لەبری گۆشەگیری و خەمۆکی و پەژارە خۆت سەرگەرمی نۆێ بونەوە بکە بوار مەڕەخسێنە بۆیرو ئەندێشەی ماندوو ئامێز ، لەکۆڕو کۆمەڵ و میوانداریەکاندا شان بەشانی ئەو دامەنیشەو پاڵی لێمەدەرەوە هەوڵی لەسەر پێ وەستانی خۆت بدەو بەدوریش بن لەو کۆڕو کۆمەڵانەی شایانی سەرنجی ئێوە نییە

و هاوشانەكانتان لەناستێكدا هەڵبـژێرن هەسـت بەكـەمی و زەبـونی نەكـەن لـە بەرامبەریاندا .

**سێیەم:**

هەمیشە هەوڵی ئەوە بدەن سـەردانی مۆزەخانـەو شـوێنەواری شـارە كۆنـەكان و ، كۆنسێرتی هونەرمەندان و ، ئەنجومەنە خەیرییەكان و چالاكی و بۆنە مەزهەبییەكان هەبونی بەرنامەگەلێكی لەجۆرە سودێكی زۆر ئەبەخشێتە مێردەكانتـان لەلایـەك و لەلایەكی تریشەوە ئەو لەتەنهایتان بێگومانەو خاتر جەمە .

چاكتریش وایە ئـەم ڕەفتـارە بگەیەنیتـە ئاشـنایان و تێیـان بگەیـەنیت ئێـوەش هاوكارو پشتیوانی خواست و ئارەزووەكانی ئەوون .

**چوارەم:**

بواری ئەوە بدەن مێردەكەتان هەستی ئەوە بكات ئێوە پەنان و پشتیوانی لێنەكەن دڵنیاش بێت لەوەی پێویستی بـەو پـەناو پشـتیوانییە هەیـە ، سـوربن لەسەر ئەوەی بەكۆمەك كردن كاری مێردەكەتان چـاكتر مەیسـەر بێـت، ناچـاری مەكەن زۆرینەی كاتەكانی بەقایل كردن و گێرەو كێشەی ئێوە لەدەست بدات .

**پێنجەم :**

هەمیشـە بیرلـەوە بكـەرەوە سـەرقاڵی مێردەكـەت بەكارەكەیـەوە و سەردەمی تەنیایی ئێوەقازانجی دولایەنە ئەبێت ، لەلایەك سەركەوتنی ئەوی تێدا دێتە دی لایەكی دیكەش بەرەنجامەكەی بۆ ئێوەیەو ئێوە لێی ئەخۆن ، (ئەستەق وتـەنی ...كۆتـایی شـەوی ڕەش هـەر سـپێدەیە ...یـان ... لەسـەرو هـەموو هەورازێكەوە نشێوییەك هەیە ...

## ١٤....ڕێگەی گونجاو بۆ
## کارە نائاساییەکانی مێرد

بەرلە هاوسەرداری و زەماوەند پێویستە مەرجەکانی کارو پیشەی مێرد ڕەچاو بکرێت و ژنیش واقیع بینانەو بەویژدانەوە حوکمی بدات .
ئایا ئەتوانی ببیتە ژنێکی چاپوك و چالاکی ئەو پیاوە یان ....نا....؟
گەر دودڵی و گومانێك لەگۆڕێ بێت باشتر وایە بکشێیتەوە نەك نەونەمامی ژین لەبن و بێخ هەڵکێشیت ...!

خانمێك ئەناسم لەبەر نەبون و هەست نەکردنی خۆڕاگری بەرامبەر کارە نائاساییەکانی مێردەکەی .... هێندە ئەو مێردە بێچارەیەی خستبۆ ژێر فشارەوە لەو پێودانگە چاك و بەسودەی کە ئەبووە چارەنوسی دوارۆژی ناچار بوو دەست بکێشێتەوە و چاو پۆشی لێبکات ، هەڵبەت با ئەوەش بڵێم هەموو مێردێك وەك ئەوەی ئێمە مەبەستمانە خواستە ناقۆڵاکانی ژن قبوڵ ناکات ؛چونکە مێردی ئەم خاتونە ناسراو ترو بەشۆرەت ترە لەوە نەك کێشەیەك لەناو بردنەکەی بێتە گۆڕێ ، چاکتر وایە پارێزی لێ بکەین ، ئەو دوای ساڵانێك پرۆڤەو مەشق و وانە خوێندن لەوەی کە خواست و ئارەزوی بوو وەك –مۆسیقا- گەیشتە ئەوەی وەك ژەنیارو ئاهەنگسازو نەوازندەیەکی چاك بناسرێت، ئەو دوای خۆڕاگری و بەئارامییەکی بێوێنە و هاوکات لەگەڵ ململانێی هەلو مەرجی نەگونجاودا پلەی سەرکەوتنی بەدەست هێنا بویە ڕابەرێکی بەناوبانگی (ئورکسترا) ی مەزن ، ئەم سەرکەوتنە مەزنەش یاوەری لاوێکی ژەنیار بوو ن شایانی باسە کەزۆرتر بەنامە

گرنگەکان نمایشەکانیان ئەکردە بابەتی شەوان ، ئەم پیاوە لەبارەی کاری شەوانی (نورکستراوە)هیچ گلەیی و گازندەیەکی نەبوو بەلام،خانمی لەو بارەیەوە زۆر نارەزاو ناقایل بوو ، کاردانەوەی نارەزاییەکانی ئەو ژنە لەسەر کاری ئەو هونەرمەندە مەزنە رەنگی دابویەوە ، ئەو بەدبەختە کاتێ شەوان لەنمایش کردن و پێشکەشکردنی کاری (نۆرکسترا) ئەگەرایەوە رو بەروی ژنێکی تورەو تۆسەن ئەبویەوە ، لەجیاتی حەواندنەوەی ماندوێتیەکەی گرژی دەمارەکانی زیاترو ماندوتر بەرەو جێگەی نوستنەکەی ملی ئەنا...!

پیاوەکە هەستی کرد توانای بەرگە گرتن و روبەروبونەوەی ئەو بارو دۆخەی لەگەڵ کاری هونەریدا ناگونجێ و لەلایەکی تریشەوە هێندە ژنەکەی خۆش ئەویست حەزی نەئەکرد ئەوی لەدەست بچێت ، ناچار لەپلەی رابەرایەتی کردنی (نۆرکسترا ) دا پاشەکشێی کرد بەدوی کارێکی رۆژانەدا وێڵ بوو تاکو شەوانە لەگەڵ ژنەکەیدا بێت ، کاتێ ژنە توانای خۆ ساچاندنی نەبوو لەگەڵ کاری شەوانەی مێردەکەیدا ئەوجا مێردەکەی پیشەیەکی تری گرتە دەست ئەویش فرۆشتنی پێداویستی و کەلو پەلی (الكتريك- کارەبایی) بوو خۆی دایە دەست خواست و ئارەزووەکانی ژنەکەی ، کاری تازەش لەگەڵ سروشت و ئەزمونی ئەودا زۆر نەسازو نەگونجاو بوو ، بەلام هیچ رێگە چارەیەکی دیکەی شك نەئەبرد ، ئێستا ئەو پیاوە زۆر ناقایلە بەرامبەر کارەکەی دەرامەتی ئەم کارەشی نیو بەرامبەری کارەکەی پێشووی نییە،هەست ئەکات نەك تەنها پێگەیشتن و گەشە سەندنی لەدەست چوو بەڵکو بەختەوەری و کامەرانیشی جێ لەق بووە، لەمش زیاتر پێویست بەرونکردنەوەی ژیانی ئەودوانە ناکات، بۆخۆتان ئەتوانن سەرپشك بن لەبری ناقایلی و نارەزایی یەکەمجاری ژن ئەمجارەیان نارەزایی پیاو لەژنەکەی دێتە گۆرێ .

ئەو پیاوانەی کارەکانیان وارسکاوە پێویستی بەکاتی نائاسایییە لێرەدا پێویستییان بەجۆرە ژنێکی گونجاوو لەبارە کەهەستی تەواو بەنەندێشەکانی بکات.

من ئەمەوێ ڕاشکاوانە پێتان بڵێم : زۆرێك لەهونەرمەندان و ناودارانی جیهانی فیلم و سینەماو شانۆ و کارو پیشەی شەوانەو و نائاسایی ، تەنها لەبەر ئەوەی ژنەکانیان نەتوانکارو نەویستی ڕێگەی سەرکەوتنی مێردەکانیانن و خۆیان لەفیداکاری ئەدزنەوەو دورە پەرێزن ناچارن دەسبەرداری کارو پیشەکانیان بن ، هەربۆیە ئەمجۆرە ژن و مێردانە هۆکاری دۆڕاندن و تێکشکانی مادی و ڕەنجەڕۆیی دەرونین .

ژن پێویستە بەرلە قۆناغی هاوسەرداری پێگەو شۆرەتی مێردەکە بپێوێ و پاشان بەڕاستگۆییەوە داوەری لەنێوان ئەوهەلو مەرجانەدا بکات و دڵنیا بێت لەوەی کەئایانەتوانێ ژنێکی چاك و گونجاوی ئەو پیاوە بێت...؟یان ..نا، کاتێ شارەزایی تەواوی بەدەست هێنا لەو بوارەدا ئەوجا بەدڵنیاییەوە بڕیاری لەسەر بدات .

زۆرێك لەخانمان بەتایبەت کچان ئیرەیی بەوژنانە دەبەن کەمێردەکانیان نوسەرو ، ژەنیارو ، سیاسەتمەدارو، وەرزشکارن ، بەشێوەیەکی گشتی پیاوانێك کارو پیشەیەکی ناودارو بەرچاویان هەیە بەلای ژنانەوە پیاوانێکی ئەشازو دەگمەنن .

من خودی خۆم کاتێ تەمەنم ١٦ ساڵان بوو حەزو خواستم ئەوە بوو لەگەڵ کەسێکی (جیهان گەڕ)دا هاوسەرداری بکەم ، تا بتوانم لەدەرونی پڕکارەساتی ئەو چێژی تایبەتی وەرگرم لەهەمانکاتدا لەگەڵ وەها پیاوێکدا گەشت و گەڕان بکەم ، بەڵام کەمتر ژنانێك هەن هەست بەوە بکەن گەر هاوسەری کەسایەتییەکی

بەرجەستە بەناو بانگ بن خۆشەویست تر لەژنانی کەسانی ناسایی دیکە وەبەر چاو دەکەوون .

خاتو "لویلتوماس"ڕێگەی ئەوەی پێدراوە پێتان بڵێت بەژ١ان بوونی یان بەهاوسەربوونی گەورە پیاوان هێندە سانا نییە ، مێردەکەی خاتو "توماس"بەیەکێ لەپیاوە ناودارە نێو ئەتەوەییەکان هەژماردەکرێت ، ژیانی ئەو هەروەك داستانی هەزارو یەك شەوەی عەرەبی پڕ لە جۆش و خرۆشە .

بەڕێز "لویل توماس" یەکێکە لە هەواڵنێرە بوێرو چاو نەترسەکانی مەیدانی جەنگ دۆزەرەوەی خاڵە مەترسیدارەکان و لێکۆڵەرو ، نوسەرو ، وەرزشکاریشە ، ئەو لەبڵندترین لوتکەکانی (هەمالایا)هێندە پاسودەو بەئارامەوە هەنگاوەکانی هەڵئەگرت کت و مت ئەتوت لەبەردەمی کامێرای هەواڵنێرەکاندا وەستاوە ، ژنی چاك و گونجاوو لێهاتووی ئەو لەبەر دەمی پێویستییەکانی ئەو مێردەیداهەمیشە لەحاڵەتی ئامادە باشیدا دەستەو ئەزەر وەستا بوو وێنەی تاوس هەردەمەی جۆرە ڕەنگێکی ئەنواند ، ئارەزووەکانی لەقاڵبێکدا دانەڕشت کە جێگەی خواست و ئارەزوی مێردەکەی بێت ، دوای جەنگی جیهانی خاتو "توماس" لەگەڵ مێردەکەیی و هاوکات لەگەڵ دەستەیەك لەگەڕیدەکانی جیهاندا گەشتەکەیان بەدەوری جیاندا دەستی پێکرد لەفەلەستین و نۆردوگای "لورنس" و نێوان عەرەبەکان ئەم ژنە ئەك تەنها یاریدەدەری گروپی جیهان گەڕانی لەئەستۆ گرتبوو ، پاش گەڕانەوەیان بۆ ئەمریکا خاتو " توماس " بویەیەکێك لە سەرقاڵ ترین ژنانی جیهان ، ڕۆژەکانی پشوو جیهانگەڕان و فرۆکەوانان و سەربازان و کەسایەتییەکانی دیکە کە مێردەکەی لەکتێبەکەیدا ناوی بردوون سەردانی ماڵی ئەویان ئەکرد،شەوانی یەکشەمە خاتو"توماس" لەماڵی خۆیدا پێشوازی لە ٥٠-

٢٠٠ كـەس میـوان نـەكرد هـەموو بەڕوخۆشـی و لێهـاتویی و كارزانییـەوە تەماشایان نەكرد .

بەڕێز "تومـاس"لەگـەڵ دەسـتیەك لەهـەواڵنێرەكانی جەنگـدا بـەردو ئەڵمانیا بەڕێكەوتن ، ماوەیەك دوای ڕۆیشتنی " توماس" بەتـەلگرافێك خـانمی ئاگـاداركردەوە كەلەكارەسـاتێكدا بەخەسـتی برینـدار بـووە خـاتو"تومـاس" ساتەكانی پەرێشانی و پەژارەیی بەئارامی و خۆڕاگرییەوە بەسەر ئەبرد .
جارێكیش ئەو فڕۆكەیەی هەڵگری "لویل توماس " بوو خۆی كێشـا بـەكێوێكی سەختداو بویە هۆی كەوتنە خوارەوەی فڕۆكەكە لە بیابانی ئەندەلوس .

خاتو " توماس " لەپاریسدا پەرێشانی و ناهـەمواری زۆری چەشـت و چاوەڕوانی دەسـكەوتنی هـەواڵی تیـا چـوون یـان سـەرفەرازی ئـەو بـوو ، لـەم دواییانەشدا بەڕێز "توماس" لەمیانەی گەشتێكدا بۆ كێوە سەختەكانی "تبـت" بەسەختی بریندار بوو ، ئەم ژن و مێردەتەنیا كوڕێكیان هەبوو ئـەویش ئەوپیشـە مەترسیدارەی باوكی هەڵگرتبۆوە ، كاتێ شۆڕشی (مو مو) هەڵایسـا كوڕەكـەی خاتو توماس لەگەڵ هێزەكانی فەرەنسادا وەك هـەواڵنێرێك لەمەیـدانی جەنگـدا ڕۆڵی سەرەكی و گرنگی ئەبینی ، بەدرێـژایی ئـەو ماوەیـەش خـاتو "تومـاس" نیگەرانی ئەو بارودۆخەی كوڕەكـەی بـوو بـەڵام هـەرگیز بـەئارامی و خـۆڕاگری لەدەست نەئەدا ، ئایا هێشتا پێت وایە هاوسەرداری كەسانی وەك "لویل توماس "هەروا گاڵتە بێت ...؟كاتی هاوسەرانی لێپرسراوان و خاوەن پلەو بـاڵای جـۆراو جۆرتان بەرچاو ئەكەوێ خۆزگە ئەخوازیت لەجیاتی ئەوانە تۆ بویتایە ...؟

خاتو "تیودور ماكالدین "فەرماندارى ویلایەتی "میرلنـد"پێـی وایـە بەدەست هێنانی پێگەیەكی وەك پێگەی مێردەكەی كێشـەو گرفتێكـی نائاسـایی تایبەت بەخۆی هەیە .

خاتو "ماکالدین"ئافرەتێکە بەو پەڕی لێبوردەیی شیاوییەوە پشتیوانی لەپێگەو کەسێتی مێردەکەی ئەکات ،ئەو لەڕاستیدا بەبارو دۆخی مێردەکەی ڕەونەق بەخشەو هەر ئەڵێی خوای پەروەردگار بەتایبەت ئەو ژنەی بۆ ئەو خولقاندووە ...لەو ئافرەتێکی چاپوك و چالاکەو ئتم و زمان پاراوو میهرە بان و دڵسۆزە . پێی ووتم :کاتێ مێردەکەی پێی نایە کۆشکی فەرمانڕواییەوە ئیدی ڕەوشی ژیانی یەك بەیەکی ئەندامانی خێزانەکەی گۆڕا ..

"ماکالدین " هەموو ڕۆژێ بەر لە خۆرکەوتن هەڵدەسێت و سەرگەرمە بەسەردانکردنی ویلایەتەکانەوە یان وتاربیژی بۆ شارەکانی دیکە و چاو پێدا خشاندنەوەیان وەك هاریکارێك هاوکاری مێردەکەی ئەکات ،ئەوڕاشکاوانە بۆی ڕونکردمەوەووتی: ئێمە لەمیانەی گەشت و گفتو گۆکانماندا تام و چێژێکی تایبەتی ئەبینین ئەگەر وەك کەسانی ئاسایی کاتی ئەوەمان هەبوایە هەموو ڕۆژێ یەکتر ببینین ئەوا هەرگیز ئەو خۆشی و کامەرانیە ئەئەبویە چارەنوسمان ....! گەشتەکانی مێردەکەم وەك ڕۆژەکانی پشودان شادی ئامێزە خۆم و مێردەکەم بەشداری سۆزو هەست و ئەندێشەکانی خەڵکین و یادەوەری و فەرامۆش نەکردنیان لەناخماندا ڕەنگیان داوەتەوە .

ژن و مێردی وەك"لویل —توماس"بێگومان زۆر بەختەوەرو کامەرانن ، ئەگەرکاتەکانی کارو پیشەی مێردەکانتان کاتێکی ناناسایەو بۆتان ئەبێتە کێشەو گرفتێك ، باشتر وایە بەپێێ ئەم ڕێسایانەکار بکەن .

### یەکەم

گەر بارو دۆخەکە کاتییە ئەوا بەخەندەوە لەپێشوازی کردنیدا بە،سەرنجی ئەوە بدە هەموو کەسێك ئەتوانێ لەبەرامبەر هەرگرفت و کێشەیەکدا بۆ ماوەیەکی کورت خۆڕاگری بنوێنێت .

- **دووەم**

گەر بارو دۆخەکە بەردەوامی هەیە ئەوا وەك خاتو "ماکالدین"خۆت بساچێنە کەبە قازانجی خۆت بشکێتەوە ، خۆتاودان بۆ دورەپەرێز بوون لەو گێرەو کێشەی کارت لێ گرانتر نەکات، سەرەتا وەك رێسای یەکەم ڕەفتار بکە تا هەلی لەبارت بۆ ئەڕەخسێت بۆ ناسینی پێگەکە و بەهرەمەند بوونت لەو بارو دۆخە .

- **سێیەم**

هەمیشە ئەوەت لەیاد نەچێت سەرکەوتنی مێردەکەت هەمان سەرکەوتنی تۆیشە، گەر وارەخسا کارو پیشەی مێردەکەت بوبەهۆی کێشەو بێبەش بوونت، وایعدابنێ ئەو پێگەیەش پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ تۆیشدا بەستووە ئەوجا مەحرومی و گرفتەکان بەسینەیەکی فراوانەوە وەربگرە .

- **چوارەم**

دڵنیابە خۆشی و بەختەوەری لەدنیادا هەروا بەخۆڕایی و بێ ماندوو بوون دەست هیچ کەسێ ناکەوێ . بەپێناسەیەکی دیکە :ناتوانن مێردەکانتان بگەیەننە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی چاك تاکو لێبوردەیی ئەو ساتانەتان تێدا نەیەتە دی کە مێردەکانتان لێتان دورن و بەسینەیەکی فراوانەوە پێشوازی لە دژوارییەکان نەکەن ،سەرکەوتن و سەرفرازی و بێبەش بوون و ریسوایی لەتەواوی کارو باری ژیاندا ڕەنگیان داوەتەوە و بوونیان هەیە ، کەسانی ڕشبین و لاواز بەدەست هەرناجۆری و ناقۆڵاییەکی ژیانەوە بەردەوام لەغەم و پەژارەدا ئەتلێنەوە گەربگەنە ئەوپەڕی لوتکەش هەرگیز قایل و بەختەوەر نابن.

## - ١٥ - ماڵ...... شوێنکاری پیاو

کاتێ ماڵ دەبێتە شوێنکاری پیاو چۆن بەربەستێك بۆ پەرێشانی و بێزاریەکانی دەستەبەر بکات ...؟

ئەو ژنانەی مێردەکانیان لەکات و شوێنی ئاساییدا کار ئەکەن پێویستیان بە خوێندنەوەی ئەم باسە نییە، بەڵام ئەگەر هۆشمەند و زرنگ بن بەخوێندنەوەی چەند لاپەڕەیەك کە هەرچەند سودیان پێناگەیەنێ فریوخواردوو نابن ، چونکە هیچ کەس شارەزایی لەبارەی ئایندەوە نییە ولەوانەشە ڕۆژێ لەڕۆژان ئەم حاڵەتە بەرۆکیان پێبگرێت :-

☜ ڕێکخستنی کارو باری ماڵەوە بۆ ژنانێك کە مێردەکانیان ڕۆژانە نزیکەی هەشت کاتژمێر یان زیاتر لەدەرەوەی ماڵدا سەرگەرمی کارکردنن ، دوای دەست هەڵگرتن شەکەت و ماندوو بەرەو ماڵ ئەگەڕێنەوە لەچاو ژنانێکدا مێردەکانیان لەهەمان جێگەو شوێنی چالاکی ژناندا واتە ماڵ کار ئەکەن گەلێك سادەیە یان هەر هیچ نەبێت ڕێك و پێك ترە ... هەر بۆیە ووتم : ئەو ژنانەی لەکاتە ئاساییەکاندا مێردەکانیان لەدەرەوەی ماڵدا کار ئەکەن پێویست ناکات ئەم بابەتە بخوێننەوە ، بەڵام، دوبارەی ئەکەمەوە ژنانی هوشیار ئەم بابەتە وەك توێشویەك بۆئەزمون بخوێننەوە ، چونکە هیچ کەسێك نازانێ ئاینده چی لەئامێز گرتووە ، خانمانیش بەگۆڕینی بارو دۆخی کاری مێردەکانیان ئەبێت چۆن ڕەفتار بکەن ...؟

## پێ وابوونی مێرد لەماڵدا

خانمی خۆشەویست :

وایدابنێ مێردەکەت لەچوارچێوەی ماڵدا دانیشتووە و تۆیش لەم حاڵەتەدا بێزاریت و نیازی ئەوەتە ژوورەکە پاك و خاوێن بکەیتەوە،بۆ ئەم مەبەستەش ناچاریت لەسەر پەنجەی پێت برۆیت تاکو دەنگی پێت زنجیرەی بیری ئەو نەپچڕێنێت ،یان کاربە گسکە کارەباییەکەت نەکەیت چونکە دەنگ و هاژەی ئەویش دوبارە هۆی توڕەو قەڵس بوونە، یان منداڵە پێڕەوکە کەرەکە بەمدیو دیوی باوکیدا خۆی هەڵئەزنێت و دەست لەکارو باری وەرئەدات ،باوکەش بێئاگایانە منداڵەکە لەخۆی دور ئەخاتەوە ، دەنگی هاوارو گریەی منداڵەکە ماڵەکە دێنێتە زەلزەلە ، بەڵام ناچاریت بۆزامن کردنی ڕازی بوونی ئەوهەستیت بەدور خستنەوەی منداڵەکە یان بەهەر هۆیەك بێت بێدەنگی بکەیت، هەستی مێردەکەت چوەتە سەر ئەوەی لەکاتی دیاریکراودا کارەکەی بگەیەنێتە ئەنجام و تۆیش نیگەرانی ئەوەیت نیش و کاری ناو ماڵت نەکردووە.

بۆ لەبەر چاو گرتنی ئاکارو ڕەفتاری مێردو باری کۆمەڵایەتی و ئابوری ئەو ، گەرتۆیش لەو جۆرە ژنانەیت هاوسەرەکانیان زۆرینەی کات لە ماڵدا سەرگەرمی کارکردنن ئەوا لەقۆناغی یەکەمدا ئەوە لەیاد نەکەیت پێویست وێنەی ژنێکی سەنگین و سەلار خۆت بنوێنی .....!

پیاو لەهەموو قۆناغێکدا بەخۆشەویستی و ڕوگەشی و ئارامی هاوسەرەکەی نیازمەندە و هەر ژنێك بەمشێوەیە پلان دابنێت ئەتوانێت خاوەنی تایبەتمەندی بێت . لێرەدا نمونەیەك شایانی وتنە :-

"دون جـــــــیلس"ئاهەنگســــــازو ڕابـــــــەری ئۆرکســــــتری سەمفۆنیکی(NBC)لەڕیزی ئەو کەڵە هونەرمەندانەیە کەتەواوی ئاهەنگەکانی لەماڵـــەوە ســـاز ئـــەکرد ، ســـەمفۆنیاکانی "دون جـــیلس"زیـــاتر لەتـــەلارە بەناوبانگەکانی ئەمریکاو ئەوروپادا نمایش ئـــەکرێن و ئێـــستاش هەروایـــە ، ئـــەو کۆپلە ئاوازانەی ئەو سازی ئەکردن هێندە سەرنج ڕاکـێش بـوون مەگەرمــەزنترین ئۆرکستراکانی وەك"توسکانی نـی " و ئۆرکسـترای"ارتـو فیلـدر" پێشکەشیان کردبێت .

دون جیلس " لەســەردەمی لاویـدا ماڵـەوەی بـەئارامترین و ئیلـهام بەخشـترین شوێنی سازدانی ئاهەنگەکانی خۆی ئەزانی ئەمەش بـو بـەهۆی ئـەو شـوێنەوارە بەنرخەو دەرکردنی ناوو شۆرەتی .

بەڕێزان جیلس و هاوسەرەکەی لەشـاری نیویۆرکـدا ئـەژین و سـەیریش لەوەدایە کە هاوسێمانن هەربۆیە ئێمە لەهەموو پێچ و پەناکانی ژیانی ئـەم ژن و مێردە زانیاری تـەواومان هەیـە ، ئـەزانین کـاترینی هاوسـەری جـیلس ڕێنمـاو یاریدەدەرو تاکە فاکتەری گرنگـی سەرخستنی مێردەکـەی بـوو ، ئـەو تـەواوی ئاهەنگەکانی لەماڵدا ســاز ئـەکات ، هەرچـەندە ژوری کارکردنەکـەی لـەنهۆمی سـێیەمی بالاخانەکەدایـە ، بـەلام هەمیشـە خوازیـاری ئەوەیـە لەسـەر مێـزی نانخواردن سەرگەرمی کارەکەی بێت ، "کاترین " بـەئارام و بـەویقارەو بەچـاکی ئەرکەکانی خۆی بەجێئەهێنێ بەتەواوی دڵخۆشییەوە دێت بەدەمیـەوە و هـەموو پێویستیەکانی بۆ جێبەجێ ئەکات ، ئەو چـاودێری منداڵەکانیشـەو زۆر جـاریش یاریـیان لەتەکـدا ئـەکات تانەبنـە هـۆی بێـزار بـوونی باوکیـان ، ئـەو تـەواوی هەوڵەکانی ئەخاتە گەڕتاکو ماڵەوەی بۆبکاتە ئارامگەیەکی ئاسـودە بـۆ ئـەوەی مێردەکەی شاکارەکانی تێدا بگەیەنێتە لوتکە...!

کاترین ..تاشپەزو کەیبانویەکی لێهاتووە، هەمیشە لەبەستەرەدا جۆرەکانی کێك و شوکولاتەو بەستەنیە دەسکردەکانی خۆی و جۆرەکانی شیرینی و مرەبای ئامادەکردووە تا پێشکەشی مێردەکەی بکات و ماندویی بحەوێنێتەوە،ئەو هەست بەشەکەتی پیاوەکەی دەکات، هەربۆیە دوکاتژمێر جارێك بەیەکێ لەو خواردەمەنیە خۆشانە ماندوێتی لەبیر ئەباتەوە .

جیلس .. وەك زۆرێك لەهونەرمەندان حەوسەڵەی ڕێکخستنی بودجەو خەرجی و کۆکردنەوەی دەرامەتەکانی نییە، کاترین لێرەدا ئابوری ناسێکی کارامەیە هەمو کارو بارێکی دارایی لەئەستۆ گرتووە کاتێ مێردەکەی پێویستی بەپۆشاك و پێلاوو پێداویستییەکانی هەیە ئەو بەجوانترین شێوازی سەلیقە کارانەوە بۆی دابین ئەکات تاکو ناچار نەبێت هەندێك لەکاتی خۆی لەو کارانەدا خەرج بکات کە سەرو ساختەی لەگەڵیاندا نییە .

من جارێکیان لەکاترینی دراوسێم پرسی ... ئایا ژن چۆن ئەتوانێت لەماڵەوە کاتی خۆی لەچاودێری کردنی مێردەکەیدا بەسەر بەرێت و بە سەرکەوتویی زاڵ بێت بەسەر کێشەکاندا ...؟

ئەو لەوەڵامدا ووتی:

کاتێ کە ژن ئالودەی ئەوە بوو ئیدی پیاوەکەی لەماڵدا سەرگەرمی کارکردن ئەبێت ، چاودێری کردنی ئەك هەر ئاسانە، بەڵکو لەزەت بەخشیشە .....! گەر بڕیار بێت جیلس ڕۆژێك لەستۆدیۆیەکی دەرەوە کاربکات من هێندە لەگەڵیدا ڕاهاتووم زۆربە خەستی دڵتەنگ ئەبم بۆی ...!

خاتو کاترین .. لەدرێژەی لێدوانەکەیدا ئەزمونەکانی خۆی بۆ ڕونکردمەوە کە هەندێکیتان لەزاری خۆیەوە بۆ ئەگێڕمەوە .

لێرەدا كارم بەچەند ڕەفتارێكی سادە كردووە بونەتە هۆی برەو پێدانی كاری مێردەكەم و بۆخۆیشم ئاسودەیی، دڵنیاشم ئەو ژنانەی مێردەكانیان لەماڵەوە سەرگەرمی كاركردنن بەسود بێت .

**یەكەم :**

هێندەی بۆتان ئەلوێت هۆكارەكانی ئارامی و خاتر جەمی دەرون و جەستەی مێردەكانتان ئامادە بكەن، پاشان وایدابنێ‌هەرگیز ئەو لەماڵ نییە لێی گەڕێن تا بەخواستی خۆی بچێتە سەركارو پاش چەند كاتژمێرێك بەئەسپایی سەرێكی لێبدە تا هەرچییەك بخوازێ بۆی ئامادە بكەیت

**دووەم :**

كاتێك ئەو سەرگەرمی كاركردنە، چاوەڕوانی ئەوە مەكە وەڵامی زەنگدەرو تەلەفۆن بداتەوە یان داوای ئەوەی لێبكەیت سەرنجی پسوڵەی ئاوو كارەباو تەلەفۆن بدات یان ئاگایەكی لەمناڵەكان بێت تا تۆ لەو بوارەدا بچیتە بازاڕیان ئاشپەزی بكەیت لێرەدا وایدابنێ گەر ئەو لەماڵدا نەبوایە لەم حاڵەتەدا چیت نەكرد ....؟

ئێستا گەر وا هەست نەكەیت، كەواتە خۆتان وەڵامدەرەوەی تەلەفۆن و دەرگا كردنەوە یان مناڵەكانت لەگەڵ خۆدا نەبردنە بازاڕ یان كاری ئاشپەزیت بێ چاودێری كردنەكەی ئەو نەكرد... بە پێناسەیەكی دیكە : ئێوە نابێت بەهیچ بیانویەك ئەو لە جێی خۆی بڵند بكەن .. مەگەر خوا نەكردە ماڵەكە گڕی تێبەر بێت .....!

**سێیەم :**

کاتێك ئەو لەماڵە هەوڵی ئەوە بدە دان بەخۆتدا بگریت و تورە نەبیت ، یان کاتێ هەست بەوە ئەکات کارەکەی لەگەڵ مەیلی ئەودا نییە یان هێندە چاوەڕوانە کارەکەی نادات بەدەستەوە لەوانەیە بەزویی نیگەران وبیزاربێت ، لێرەدا ئەرکی سەرەکیتان ئەوەیە بەرەفتاری جوان و نەرم و نیانی دڵی بدەنەوە و ئاسایی بکەنەوە .

**چوارەم :**

ئامشۆو رەوتی دۆست و ئاسراوەکانتان وارێکبخەن کاریگەری لەسەر کارەکەی ئەو رەنگ نەداتەوە ناچاری ئەوە نەبێت هەندێك لەکاتی کارەکەی لەدەربڕینی ئەدەب و پێشوازی ئەواندا بەهەدەر بچێت . هەڵبەت گەر خانویەکی گەورەتان هەبێت ئەتوانی بەشێکی بۆ ئەوجۆرە پێشوازیانە تەرخان بکەیت تانەوانە کارلە مێردەکەت نەکەن یان گفتوگۆو دەمەتەقێ زنجیرەی بیری ئەو نەپسێنێ ، خۆ هیچ ناستەنگێکیش نیە لەکاتی کاری پیاوەکەتدا پێشوازی و دەمەتەقێ لەگەڵ دۆست و ئاسراوەکاندا بکەیت بەڵام گەر وارِسکا مێردەکەتی پێ لەکار ببێت واتە ئەویش وەك تۆ ناچاری پێشوازی ببێت ئەوە دیارە کارێکی باشت نەکردوە .

**پێنجەم :**

بەرێکەوتن و هاریکاری مێردەکانتان کاتێك دیاری بکەن لەوکاتانەدا منالەکانیش ئازادانە گەمەو مەزاقی خۆیان بکەن و نەبنە هۆی بێزار بونی ئەو ، لێرەدا دیارە هیچ جۆرە چاوەڕوانیەك لە مندالْ ناکرێت کە تەواوی رۆژ بێدەنگ و ئارام بێت . خاتو کاترین لەکۆتایی ڕێنماییەکانیدا ،وتی: من بەڵێنتان پێئەدەم لەمجۆرە رەفتارانە سود مەند بن ، چونکە من خودی خۆم بەدرێژایی ٨ ساڵی

ڕابردوی ژیانی هاوسەردارییان ، مێردەکەم بەبەردەوامی لەماڵەوە سەرگەرمی کارکردن بووە لەو ماوەیەشدا من وەك چاودێرو دەستەو نەزەر هەردەم لەخزمەتیدا بووم ....!

**خانمی خۆشەویست :**

**گەر ئێوەش دارای ئەوجۆرە هاوسەرەتانن کەلەماڵدا سەرگەرمی کارکردنە لەهەوڵی ئەوەدابە تاکو یاساکردارییەکانی(دستور العمل) کاترین دەستەبەر بکەیت بۆبرەو پێدانی ئەرکی ئەوو ئاسودەیی خۆیشت..**

١٦ ژنانی پیشەوەر

**ئایا كارەكانتان كۆسپێكە لەبەردەم پێشڕەوی پیاودا ...؟**

ئەم بابەتە بەپرسیارێك دەست پێئەكەم خوازیارم پڕبەدڵ و ڕاستگۆیانە وەڵامی بدەیتەوە ...

گەر دارای كارو پیشەیەكیت كۆسپە لەبەردەمی پیاوەكەتدا ئایا ئامادەییت تێدایە لەبەر خاتری ئەو چاو پۆشی لەو پێگەیەت بكەیت...؟

چاوەڕوانم ، خوازیاری ئەوەشم وەڵامەكەتان ئەرێ بێت ...! بەڵام گەر ئەو ئامادەییەت نییە پێگەی مێردەكەت بگۆڕیتەوە بە پێگەكەی خۆت ، ناچارم بڵێم: لەوەڵامەكەتان ڕازی نیم و بێپەردەش ئەڵێم : لە هەڵبژاردنی ئەم كتێبەشدا هەڵەیت، چونكە تۆ دارای ئاوەزێكی لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم بابەت و كتێبەدا جگە لەكات بەفیڕۆدان ئەبێ بەدەردی تۆ ناخوات .

خانمی بەڕێز:

دیارە حەز بەو وتەیەی سەرەوە ناكەیت یان شایستەت نییە ، كەواتە پێشڕەوی خودی خۆت لەپێگەی هاوسەرەكەت بەلاوەگرنگترە ، ئەوا ئەبێت لەهەوڵی گۆڕینیدا بیت . لێرەدا یادەوەرییەكم دێتەوە یاد باس لەحاڵی كەسێك دەكات لەبنەڕەتدا پێی وابوو پێگەكەی خۆی باشترە لە پێگەی هاوسەرەكەی ... لێرەدا باكەمێك هەڵوێستە بكەین ..

خاتو "زیتا ولز"هاوسەری بەڕێز"كاروت"كە هەنوكە جیهانگەردێكی ناسراوە ، ئەو بەرلە هاوسەرێتی شاكاری گەلێك سەمەرەی لێ ئەوەشایەوە

"زیتا" سەرگەرمی کاری (نوسەر-وتەبێژی ڕادیویی)بوو خاوەنی شوێن و کاری تایبەت بوو بۆکەسایەتی ناودارو، دامەزراوەو کۆمپانیا گەورەکان ئاگاداری و تەبیلیغاتی بۆ ئامادە ئەکردن .. ئەو لەپێناسەیەکی کارو پێگەکەیدا ووتی:

بەڕێز"کاروتولز"یەکێك بوو لەکڕیارە تایبەتییەکانی خۆم و بەهۆی سەردان و وتو وێژو کاربەیەکتری بوون یەکدیمان تەواو ناسی ئەمەش بویە هۆی تێکەڵاوی و سەرەنجامی هاوسەرداریمان ...

ئەولەدرێژەی وتەکانیدا ووتی: مەرجی هاوسەرداریمان ئەوەبوو درێژە بەکاری وروژێنەرو پڕجموجوڵی خۆم بدەم ، واتە پارێزگاری لەکارو پێگەکەی خۆم ، هاوسەرێتی ئەم جوتە لەسەرەتای وەرزی بەهاردا دەستی پێکرد ،چەند مانگێکی دوایی واتە سەرتای دەسپێکردنی وەرزی هاوین بەڕێز"ولز" بڕیاریدا بەسەرکەوتنی بۆ لوتکە شاخی ئارارات سەفەری ڕوسیاو تورکیا بکات ، " زیتا" یەکەمجار بڕیاریدا هەرلەشارو شوێنکاری خۆیدا وەك جاران بمێنێتەوەو دەسبەکار بێت کەچی کاتی نزیك بونەوەی سەفەرکردنی مێردەکەی نەیتوانی زاڵ بیت و لەبڕیارەکەی پەشیمان بۆوە هەربۆیە هاتە سەر ئەو بڕوایەی لەگەڵ ئەودا ئەمیش بڕوات.

ژن و مێردی نەوجەوان کەوتنەدوای قەدەرو کارەسات و ڕوداوی نادیار ، گەرچی ئەم سەفەرە وەك دێوەزمە پڕلەبیم و ترسی ئەم دوانە بوو ، بەڵام کاتێ باسی سەفەر لەکتێبی(سەرپۆش) ی بەڕێز "کاروت" هاتە گۆڕێ ئەوساڵە بەساڵی پڕفرۆشترینی ئەو کتێبە ناسراو تەواوی ترس و بیمی ئەودوانەی قەرەبوو کردەوە .

دوای گەڕانەوە لەم سەفەرە پڕمەترسیە خاتو "زیتا " گەیشتە ئەو بڕوایەی پێگەو کارەکەی خۆی هەرچەندە پڕدەرامەت بوو بەڵام لەبارتەقای ئەم سەفەرەدا شتێکی هەنوکەیی و بچوکە بگرە ماندوو ئامێزیشە ، ساڵو نیوێك

دوای سەفەری یەکەم ئەو دوبارە لەگەڵ مێردەکەیدا کەوتەوە ڕێ ئەمجارەیان بەرەو "مەکزیک"و لوتکە و ترۆپکەکانی زنجیرە شاخەکانی ئەوێ بەڕێ کەوتن ، بەلآم بەپێچەوانەی جاری پێشووەوە ئەمجارەیان مەترسیدار بوو بویەهۆی شەکەتی و ماندووبونیان برسێتی و تینوێتی سەرماو لەوانەش بەدتر ترسی نەتوانینی گەڕانەوە و مانەوەیان لەلوتکە بەرزو بەفراوییەکاندا ئەمانە زیاتر هەڕەشەیان لە"زیتا " ئەکرد بەلآم لەهەمان کاتدا ئەم ئەزمون و کارە نوێیە بەلێهاتویی و لێبوردەیی "زیتاوە"سەرچاوەیان وەرگرت هەرئەمانەش تەکانی سەختیان لەبۆچون و دەرونی ئەو ئەدا ، سەرماو بەستەڵەك و بەفری چاڵ و چۆڵە ترسناکەکانی مەکزیك وەك قامچی بەڕوخسارو پەیکەری ئەودا زەریان ئەوەشاند دواین ئومێدی سەرفرازی لەکارەساتانەدا لەدیدو بیری "زیتا"وە سەریان هەڵدا ئەو بەڕاستی گەیشتە ئەوبڕوایەی هاوسەربونی بە"کاروت ولز" هەزاران جار شکۆمەندترە لەو پێگەیەی ئەولە نوسەریی و وێژەری و ئامادەکاری دامەزراوەو کۆمپانیاکان ،پاش گەڕانەوەیان ئیدی دەستی لەکار کێشایەوە بڕیاریدا لەهەر شوێنێك لەگەڵ هاوسەریدا بێت و بۆ تەنها ساتێك لێی دور نەبێت ، ئەم دو هاوسەرە درێژەیان بەگەشتە درێژخایەنەکانیان داو،سەردانی ئەفریقاو جەنگەڵەکانی –مالایا- تایسلند- ژاپۆن-پاکستان و کشمیرو شایەدحاڵی ئەوڕوداوانە بوون کەهەرگیز نەیانبینیبو .

ئەو خودی خۆی ئەڵێت:-

کاتێ بیرلە ڕۆژانی ڕابردو ئەکەمەوە ئەورۆژانە وەیادم دێنەوە وام ئەزانی هەبونی کارو پیشەیەکی تایبەت بەخۆم گەلێك گرنگەوپێکەنینم بەخەیاڵ خاوی و ساویلکەیی خۆم دێت ،گەر لەئەزمون و کارو چالاکییەکانی هاوسەرەکەمدا بەشداریم نەکردایە ،چەندە ژیانم لەجوغزێکی وشك و بێتامدا

دەقی ئەبەست و چەندەش ماندووناميز ئـەبوو ..؟زۆر بەتامەزرۆییـەوە هاوكـاری هاوسەرەكەمم كردو لەگەڵ سەركەوتنەكانیدا منیش هەمانشێوە هاوتەریب بـووم هەركاتێكیش ڕێبكـەوێت لەكارێكـدا توشـی نوشسـتی بـبین ئـەوكات دوقـۆڵی ڕوبەڕوی ئەبینەوە تاكو لەبنج و بناوان ڕیشەكێشی ئەكەین .

هەست ئەكەم پێ بەخشینی كتێبی(سـەرپۆش) لەلایـەن مێردەكەمـەوە لەژێرناوی ﴿پێشكەشە بەژیتای هاوسەرم ،كەچاكترین یـارو یـاوەری میهرەبانمـە﴾ تاكە خەڵات و میدالیای شكۆمەندیە تائێستا پێم بەخشرابێت ...!

نازانم .. هیچ ستایش و ئافەرینێك لەخودی خۆمدا ئەڕسـكاوە بتوانـێ بارتـەقای ئەوستایشە پاڵفتەیە بكاتەوە ، كەواتە هەرژنێك لەبرەوپێدان و پێشكەوتنی كارو چالاكی مێردەكەیدا چاوپۆشی لەپێگەو قازانجی خۆی بكات و گیـانی لێبـوردەیی تێدا زیندو بێت ئەوا سـەركەوتنی مێردەكـەی پـڕ بـەهاترین پاداشـتێك ئـەبێت لەژیاندا بەدەستی ئەهێنێت .

بەهەڵەشدا ئەچیت ، لێردا من نامەوێت لەنرخ و بەهای كاری ئەو ژنانە كەم بكەمەوە یان خوانەخواستە بەچاوێكی كەم سەیری بكەم كەناچارن بـۆ زامـن كردنی گوزەرانی ژیانیـان كـار بكـەن ، مـن لێـرەدا ڕێزیكـی زۆرم بۆیـان هەیـە كەتواناى لێهاتویی و كاركردنیان لەئەستۆدایە گوزەرانی ماڵ و خێزانیـان بـەڕێوە ئەبەن ، چونكە دور نییە خوانەكردە مەرگ یـان بێكـاری پیـاو نـازی خێزانییـان بشێوێنێت ، چونكە كەس هەواڵی ئایندەی نییەو ئـەم ژنـە كارامانـە ئـەو كاتـە ناچاری ئەون شـان بدەنـە ژێـر ئـەو كارەسـاتانەو خێزانـەكانیان لـە شكسـتی و بەدبەختی بپارێزن.

بەتێڕامانێك لەوەی باسمان كرد ناتوانین نكوڵی لەوە بكەین گەر ژنێك تەواوی بیرو هۆشی سەرگەرمی كارو چالاكی خۆی بێت و بتوانێت لەسەرخستن و بەرەوپێش بردنی مێردەكەشیدا ڕۆڵی خۆی ببینێت .

بەلوتكە گەیاندنی مێردەكەت تەنیا ئەركێكی پیرۆزو گرانەو ژنێك نەتوانێت لەئەستۆی بگرێت خۆی سەركەوتوانە هەوڵ و كۆششەكانی بۆ بخاتە گەڕ.

دیارە لەم ڕووەشەوە وەكو هەموو كارێك حاڵەتی ناڕاستەخۆ( استسنائی)دێتەگۆڕێ ، بەڵام بەدواداچون و ئەزمون بۆی سەلماندوم كاتێ ژن و مێرد یەك ئامانجی هاوبەشیان هەبێت زۆرتر سەركەوتویی پێشكەوتن یاوەریان نەبێت .

بەم پێیەش ژنی میهرەبان گەر بزانێ كارو پیشەكەی دەبێتە كۆسپێك بۆپیاوەكەی ڕێگری ڕێی ئاسودەیی و سەركەوتنە ئەوا باشتر وایە چاو پۆشی لێبكات .

## ژنانی دواکەوتوو

مرۆڤ سەبارەت بەخودی خۆی و ئەوانە پەیوەندیدارن پێوەی پەیوەندیەکی سەیری هەیە ، گەرکاتی وتو وێژو هاونشینی بەتێڕامان و سەرنجەوە گوێ بیستی ئەندێشەکانی بیت بێگومان ئەندێشەکانی خۆتت بیر ئەچێتەوە .

بەر لەچواردەساڵ ،کاتێك (هاینز) زەماوەندیان سازکرد، خانم هێندە ژنێکی شەرمن و کەمرو بوو کەبۆی بوبو بەحاڵەتی ترس و گومان و خۆ حەشاردان ، چونکە لەنامادەبونی کۆڕوکۆمەڵ و میوانداریدا ئەو شەرمێکی بێوێنەی ئەکردو هەمیشە لێی ئەسڵمییەوە هەربۆیە توشی کەنار گیری بوبو.

بارودۆخی خاتو (هاینز)تان لەزاری خۆیەوە بۆ ئەگوێزمەوە :

(... من لەدیتنی کەسانی نەدیوو نەناس زۆر ئەترسام و سڵم لێئەکردەوە هەربۆیە وەکو کێوی تەنها هەر خۆمم ئەناسی ، گەر ڕێکەوتایە بچومایەتە نێو کۆڕێکەوە وامئەزانی لەوێ مرۆ خۆری تێدایە و دەم و دەس ئەخورێم...!)

هاوسەرەکەشی نەوجەوانێکی خوێن گەرم و پیشەکەیشی بریکاری داواخوازی گشتی بوو لەشارو شوێن وپێگەی خۆیدا نوێنەری چالاکی سیاسی و بەو هۆیەشەوە ئەبوایە پەیوەندی بەردەوامی لەگەڵ خەڵکیدا هەبوایە لەکۆبونەوە گشتیەکان و وتە گۆیی ئەنجومەنەکان و بۆنە تایبەتیەکاندا بەشداری بکات و پێشوازیشیان لەماڵدا بکات .

ئەو بەهۆی ئەم تێکەڵاو بونەی لەگەڵ خەڵکیدا ئەبوایە هاوسەرەکەی ڕۆڵی تایبەتی ببینیایە ، بەڵام ئەو ترس و بیمە هێندە باڵی بەسەر خانمدا زاڵ بوو هەستی ئەو گرنگی پێویستی دەرکەوتنەی لەنێو کۆمەڵدا سست کردبوو ، بەلای ئەوەوە تێگەیشتن لەو گونجاندنەی لەگەڵ خەڵکیدا کارێکی مەحاڵ بوو ، بەم حاڵەشەوە کاری گەیشتە ئەوەی بەناچاری ئەو ترس و بیمە لەخۆی دوربخات و تێکەڵ بەو جیهانە بێت .

خانم ماوەیەکی زۆر گەردو خولی ئەوەی بوو خۆی لەو ترس و لەرزە دەرباز بکات ، سەرەنجام گەیشتەت ئەو بڕوایەی یان ئەبێت دەمامك لەسەر ئەو ترس و لەرزە لابدات یان .... دەسبەرداری مێردەکەی بێت ، بەهەرحاڵ بڕیاری تەواویدا بەهەر نرخێك بووە ئەبێت لەم ئەبەردییەدا سەرکەوتن بەدەست بێنێ ، بەڵام ئەی ئەزانی.. چۆن و ، کەی..؟ لەکوێوە دەست پێبکات تا ئەوکاتە لەبەختی خۆی ڕۆژێکیان چەند ڕستەیەکی لەراپۆرتی ڕۆژنامەیەکدا بەرچاو ئەکەوێت .

مرۆڤ سەبارەت بەخودی خۆی و ئەوشتانەی پەیوەنیدارە پێوەی پەیوەندییەکی سەیری هەیە ، لەوتوێژو مشت و مڕدا یان بڕیار لەبەرامبەر وەرگرتن ... بەتەواوی تێڕامانەوە پێویستە گوێبیستی وشەو پیتەکانی وێژەرێکی بەرامبەرت بیت مۆڵەتی ئەوەی بدەیتێ تەواوی پێچ و پەناکانی تایبەت بەکێشەو دەردەسەری و سەرکەوتنەکانی خۆییت بۆ باس بکات ، کاتێ تەواو تێڕمایت ئەوکات خودی خۆتت بیردەچێتەوە .

ئەمانە کاریگەی خۆیان لەسەر خانم بەجێ هێشت و سەرلەبەر گۆڕانکاری لەژیانی ئەودا بەرجەستە کرد .

خاتو "هاینز" بڕیاریدا هاوشێوەی (دستور العمل)یاسای کرداری تـەواوی ئەوڕاپۆرتەی خوێندبویەوە ڕەفتاری پێ بکات ، چونکە لەم هـەلو مرجـەدا لانـی کەم ئەو ئەیتوانی گوێ بیستی قسـەی بەرامبەرێکی خۆی بێت خۆی ناچاری قسـە کردن نەبێت ، ئەو هەنگاو بەهەنگاو نەخشەکەی خستە قۆناغی کـار پێکردنـەوە زۆر بەزویش سەرکەوتنی لەئامێز گرت .

ئەو بەسەرهاتی خۆی بەمشێوەیە بۆگێڕامەوە :

بەپەیوەنـدی کـردنم لەگـەڵ خەڵکیـدا وردە وردە هەسـتم بەڕەوینـەوەی ترسـەکەم کـرد و لـەوە گەشـتم ئـەوانیش بەشـی خۆیـان کێشـەیان هەیـە ، لەتێگەیشتنی زیاترم زیاتریش خۆشم ئەویستن بەجۆرێك ئێستا بەدوای هاوڕێیەتی وێڵـم .لـەئامادە بـون و ڕوبـەڕو بونـەوەی خـەڵکی ئیـدی بێـزار نـیم و پـەژارە دامناگرێت ، پێشوازی کردنیشیان لەماڵەوە بەڕاستی چێژی لێ ئەبینم هەمیشـە لەبۆسەی ئەو دەرفەتەشدام لەگەڵ هاوسەرەکەم بەشداری میواندارییـە ڕەسمیـەکان بکەم و سوپاسی بێپایانی خوا ئەکەم کەنەبومە کۆسپێك لەبەردەم پیاوەکەمـدا ، چونکە ئەرکی سەرشانی هەمو ژنێکە بەجۆرێك خـۆی پـەروەردە بکـات مایـەی شانازی و شکۆمەندی پیاوەکەی بێت .

فەرمانداری یەکێ لەویلایەتەکانی ئەمریکا پێی ووتم:

ئەو بەشـی هـەرە زۆری سـەرکەوتنەکانی خـۆی بەقـەرزاری هاوسـەرێتی کردنی ژنێك ئەزانێ خاوەنی ڕەوشت و پەروەردەیەکی جوان و لێهاتوو دەگمەنە ، ئەم فەرمانداره بەتوانایە لەناوچەیەکی کۆچەری یەکێ لەویلایەتـەکانی ئـەمریکا هاتۆتە دنیاوە ، ئەو ئەڵێت: گەر لەگـەڵ کچـە دراوسـێیەکی خۆیـدا هاوسـەریم بکردایـە هەرگیزئـەم جـۆش و خـرۆش و وەدەسـت هێنـانی زانیارییـەم چـنگ نەدەکەوت ، ئەمنەتوانی لەشارستانی دنیانی ئەمڕۆدا دەسبەکاربم ، سوپاسی خوا

نەکەم ژنەکەم لەوانە نیە .. ، ئەو بەسەلیقەو سادەو لەخۆ بوردەیە ؛ بەلای ئەوەوە گوزەراندندن لەگەڵ کەسانێکدا جیاوازییەکی ئەوتۆی نیە جا پلە داربن یان لەئاستێکی نزمدا بن ، ئەوهێندە بەئاداب وخۆش ڕووە پیاو ماقوڵان و لایەندارانیش لەوتوێژ لەگەڵ کردنیدا چێژ ئەبینن هاوکات هێندە دڵنەرم و میهرەبانەکەسانی بێلایەن و سادەو ئاسایی لەناخەوە خۆشەویستی بۆ دەرئەبڕن .

ڕێنمایی :

خۆشەویستم وامەزانە کەمێردەکەت کارێکی گرنگی لەئەستۆ نەگرتووە ئیدی پێویستی بەهاوکاریتان نییە ..نە ء.. لە هەلو مەرجێکی وادا پێویستی زیاتری بەهاوکاریتانە ، ناودارانی جیهانی زانست و هونەرو سیاسەتمەدارو ئەوەکانی دوارۆژ لەنێوانیانیاندا کەسانی نادیار، بەدوری مەزانە یەکێك لەوانە هەڵکەوێت مێردەکەت بێت یان، ببێتە مێردت ؛ چونکە کەس لەلوتکەوە دەستی پێنەکردووە، بێگومانیش هیچ کەسایەتیەکی سەرکەوتو بەناوو شۆرەتەوە پێی نەخستۆتە دنیاوە .

خانمی بەڕێز ڕاستگۆیانە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەرەوە :

- گەر لەدوای ١٠-٢٠ ساڵی دیکە مێردەکەت گەشتە ئەو پێگەیەی دەسەڵاتێکی گەورەی کۆمەڵایەتی لەئەستۆ گرت ، تۆ ئەتوانیت جێگەی متمانەی تەواوی ئەوبیت .....؟

گەر وەڵامەکەت ئەرێیە ،ئەوا بۆ ئەو لێهاتوییە هەوڵی تەواو بخەرەگەڕ ، گەرماوتەو هێشتا تێتدا دروست نەبووە هەر لەمڕۆوە دەسبەکاربە و وێنەی خاتو "هاینز" ترس و دودڵی و گومان لەخۆت وەدەرنێ ، گەر لەگەڵ کەسانی بێ ناوەزو بێ ئەندێشەدا لەهەڵسو کەووتدایت ، بیگۆڕەو لەکەسانی بەهەست و هونەر پیشە نزیك بەوە .

گەر ڕادەیەكی خوێندنی ئەوتۆت نییە ، ئەوەش مەكە بەهانەو دەسپێكی دەستت گوایە بواری وانە خوێندن و حەوسەڵەی خوێندنەوشم نییە ، ئەمجۆرە بیانوانە تیماری دەردی ئێوە ناكات ، چونكە بەڕای من گەورەترین هۆكاری دواكەوتەیی دابڕانە لەزانست و خوێندنەوەو دانایی

"ئەریك جانسون" هاوسەری بەڕێوەبەری گشتی یەكێتی سینەماكانی ئەمریكا نوسیویەتی

كلیلی دەرگای هاوسەرداری سەركەوتوو ئەمەیە (...پێویستە ژن هێندە وریاو لێهاتوو بێت كاتێ مێردەكەی لە كارو چالاكی ئیداری و پلەی بەرزی كۆمەڵایەتیدا خۆی بینیەوە ئەمیش خۆی تەیار بكات شان بەشانی ئەو هەماهەنگ و پێشڕەو بێت ...)

"خاتو جانسون" ئەڵێت:دور نییە پێت وابێت مادام ئەمرۆ مێردەكەت خاوەنی پلەیەكی ئەوتۆی كۆمەڵایەتی نییە.

كەواتە هیچ پێویست بەخۆ سازدان و ئامادەكاری ناكات، با ئەوەشتان پێ بڵێم كاتێ هاوسەریم لەگەڵ مێردەكەمدا سازدا هیچ كامێكمان هەواڵی ئایندەمان نەبوو ، "ئەریك"ی مێردم پیشەكەی وردەواڵە فرۆشی بوو ،ئەولەكۆچەو كۆڵانەكاندائەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ بژێوی پەیدا ئەكرد ، تەنها بڕوای كەسێتی ئیلهامی بۆكردم ڕۆژی گەیاندینە ئەمڕۆ، كەس هەواڵی لەئایندەی نادیار نییە ومرۆڤی زرنگیش ئەوەیە خۆی بۆ فرسەت و پێشهاتە نادیارەكان تەیار بكات ، ئێوەش گەر خوازیارن كاتێ مێردەكانتان بەپلەو پایەی بەرز گەیشت پێویست لەكەمترین دەرفەتدا سەرنجی خەڵكی كێش بكەیت ،هونەری هاوڕێگرتنو خۆشویستن و سازش لەگەڵ خەڵكیدا یەكەمین هۆكاری بنەڕەتی سەركەوتن و خۆشەویستی ژنە لە كۆمەڵدا ، سازش و سازگاریتان لەگەڵ خەڵكیدا هاوكاتە

لەگەڵ پێشکەوتن و کارو ماندو بونتانی ئەوێت ، کاتێ بۆنوسینی ئەم کتێبەی بەردەستت سەرگەرمی بەدوادا چون و کۆکردنەوەی باس و بەسەرهاتە زیندووەکان بووم ، چاو پێکەوتنی گەلێك سەیرو سەمەرەم لەگەڵ بەڕێوەبەرێکی گشتی یەکێ لە گەورەترین کارگە سەربەخۆکانی ئەمریکادا سازکرد، ئەم بەڕێزە پێی ووتم:- هەندێ جار لەکاری ئیداریدا هێند ڕۆدەچێت تاوای لێدێت هەڵسوکەوتی ئاسایی لەگەڵ کەسانی دیکەدا بیردەچێتەوە ، پاشان بەوپەڕی سەربلندییەوە وتی:ژنەکەم هێندە سەری جەنجاڵ نییەو زۆر میهرەبانانە مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا دەکات ، نمونەش دوێنێ خۆم جلەکانم برد بۆ شۆردن و ئوتو کردن هەرکە وەژور کەوتم بێ سەلام و هەواڵپرسین فەرماندانە فەرمانم داو ئەمەم بۆ چی لیبکا و چی لێنەکات..! بەزوترین کاتیش دەستو بردیان لێبکات ...! تا کابرا سەرێکی بلند کردو ئەوجا بەشێوەیەکی پەژارەوە تەماشایەکی کردم و وتی: بەڕێز تکا دەکەم بۆ ئەمجۆرە کارانە خوازیارم هاوسەرت سەردانمان بکات .

بەڕێوەبەر لەدرێژەی وتەکەیدا وتی:

بێگومانم خەڵکی زیاتر ئەویان لا پەسەندە ، چونکە ڕەفتاری گەلێك گونجاوە ، نەرمە ، میهرەبانە ، ئەمەیش زیاتر بونەتە هۆی خۆش ویستنی ، ئەو کاتێ بەلای دراوسێ یۆنانیەکەماندا تێپەڕ دەبێ بەزمانی یۆنانی سڵاوو هەواڵپرسیان دەکات ، کەمێ خوارتر لەگەڵ میوە فرۆشێکی ئیتالیدا بەزمانی ئیتالی وتو وێژی لەگەڵ دەکات ، ئەمەش لەحاڵێکدا بەقاڵ و دوکاندارەکانی تر گرنگییەکی ئەوتۆ بەو شێوەیەی ئەو بەمن نادەن ، ئەمەو هاوسەرەکەم ئەرکی فێربونی ئاخاوتنو زمانە دایکەکانی ئەوانی لەئەستۆ گرتووە ، ئەو هەمیشە خوازیارە لەبەرچاوی خەڵکیدا کەسێکی دڵنەرم میهرەبان بێت ، بەرەنجامی چاکیشی بەدەست هێناوە ، من هەرچەندە ئەم خاتونەم نەدیوەو

نایناسم بەڵام ئارەزومە پێی ئاشنا ببم ، ژنێك هێندە گونجاوو ئیلهام بەخش بێت بەگرانبەهاترین سەروەت و سامانی مێردەکەی هەژمار ئەکرێت .

پیاوی سەرقاڵ هەمیشە بیرو هۆشی لەکارەکەیدا ڕۆچووە ، زۆر جار ناتوانێ هاوکێشەیەکی هاوسەنگ لەگەڵ هاوکارو هاوڕێکانیدا ڕێك بخات بەم پێیەش لەئاست مامەڵەو هەڵسو کەوتەکانیدا دەستەوسان و هەژار دەبێت ، وەها پیاوێکیش چەند بەختەوەرە گەر هاوسەرێکی چاپوك و چالاك هاوسەنگی ئەو ناکارو ڕەفتارانەی بۆ بەرجەستە بکات ، نەهێڵێت زنجیرەی هاوڕێیەتییەکانی هاوسەرەکەی شل ببنەوە و لیێ بترازێن چونکە وێنەی باڵوێزیکی گەورە نیەت پاکی و کەسێتی هاوسەرەکەی بەدنیا ئەناسێنێ .

بەگرتنە بەری چەند هەنگاوێکی سادەو ساکار ژنێکی میهرەبان ئەتوانێ لەکۆمەڵدا پشت و پەناو سەنگەری هاوسەرەکەی بێت ، هەڵبەت ئەنجامی ئەم کارەیش وەك هەر هونەرێك پێویستی بەمەشق و ئەزمونە :

خاتو "کالتن بورن"مێردەکەی سەرۆکی دەستەی پەیامنێرانی ڕۆژنامەکانی ئەمریکایە بەشێوەیەکی شایستەو بەرچاوی لێزانانە لەپشتیوانی مێردەکەیدا ڕۆڵی گرنگی هەیە ئەو ئەڵێ: خەڵکی بە وەستای قسان نێوزەدی دەکەن وێڕای ئەمەش هەستی شەشەمی زۆر بەهێزە ئەزانێ چۆن و کەی قسەی خەڵکی ببڕێت ، کاتێ چاو پێکەوتنێکم لەگڵ سازدا ووتی:کاتێ میوانداری و پێشوازییەکی دۆستانە دێتە گۆڕێ ،گەر باس و بابەتێکی نەشیاووناپەسەند هاتە گۆڕێ بویە هۆی مشت و مڕو کێ بەرکێ لەبۆسەی دەرفەتێکی گونجاودایە ، بۆنمونە بەمێردەکەی دەڵێت :ئەزیزم بۆچی لەگەڵ جەنابی سەرهەنگدا سەبارەت بەفلانە شت یان فیسارە بابەت وتوێژێ ساز ناکەیت ...؟ هەرئەم ڕستەیەش ئاو دەکات بەسەر ئاگری باسەکەدا و باسێکی گەرم و گوڕتر دێتە ئاراوە ، ئەو

هەمیشە ئەزانێ لەوتارە سیاسیەكاندا مێردەكەی لەپرسیارە گرنگ و قورسەكانی ئامادەبوان قوتار بكات و لەفشاری ئامادەبوان دەربازی بكات ، جارێك لەهۆڵێكدا سیمینارێكی سازدابوو لەلایەن ئامادەبوانە هێندە كەوتە بەر ڕێژنەی پرسیار ، گەردەسبەجێ خانم بەهانایەوە نەچوایە مێردەكەی دەست و پێی خۆی ون كردبوو ...! ئەو بەخێرایی دەستی بڵند كردوو بەئامادەبوانی ووت : بەڕێزان مۆڵەت بفەرموون ...! منیش پرسیارێكم هەیە ... پاشان ووتی : ژنەكەی بەڕێز "كالتن بورن" ئەیەوێ بزانێ مێردەكەی چ كاتێ بۆنان خواردن بەرەو ماڵ ئەگەڕێتەوە ...؟لێرەدا ئامادەبوان زمانی خۆیانیان گەست و بەڕێز "كالتن بورن"یش بەرەو ماڵ گەڕایەوە بۆ نانخواردن.

خزمەتێكی دیكەش هەیە ژن بتوانێ بەمێردەكەی بكات یان هۆكارەكانی سەركەوتنی مێردەكەی فەراهەم بێنێت بەڵام پێویستی بەنەویندارى و خۆشەویستی لەڕادەبەدەر هەیە ،گەر لێزانانە دەسبەكار نەبێ دور نییە ئەنجامێكی شوم و ناهەمواری لێبكەوێتەوە ئەو خزمەتە گرنگەش ئەوەیە ، ژن هێندە وریا بێت مۆڵەت نەدات مێردەكەی لەئەنجامی سەركەتنەكانیدا مەغروور لەخۆ بایی بێت و سەركەشی وای لێبكات توشی ملشكان بێت ...! لەم كتێبەدا دەربارەی بەهێزكردنی پیاو باسێكی فراوانمان كردووە بەڵام ، هەموو ژنێك ئەزانێ هەندێك پلەو پێگە هەن مێردەكەی وەئاگا بێنێتەوە هێشتا ڕێی درێژتری لەبەرە بەمشێوەیە سەركەشی و بایی بوون لەپیاو دور ئەكەوێتەوە بۆ وەدەست هێنانی سەركەوتنی باشتر پشتێنی هیمەت توندتر ئەكاتەوە ، هەر ژنێك بتوانێ بەوریایی ئەم بۆچونە دەستەبەر بكات میدالیای زیندویی و ئەمری لەملی مێردەكەی كردووە .

"دیزرائیلی" سیاسەتمەداری سەدەی نۆزدەیەم بەهۆی ڕەخنــە شــیاوەكانی ژنەكەیەوە گەیشتە ئەو ناوو شۆرەتە .

بەڕێز "لی .من.استو" یــەكێك لەكەســە ناودارەكــانی هاوچــەرخی خــۆم نوسەرو وتاربێژێكی سەركەوتووە ئەڵێت : تازە دەســتم بــەكاری وێــژەری كردبوو سەرنجی بیسەرانم بەلای خۆمدا كێش ئەكرد خۆشحاڵ بووم كاتــێ وتــەكانم ئەگەشتنە كۆتایی دەوریان ئەگرتم و ستایش و پیا هەڵــدانیان بــۆ ئــەكردم ، ئــەم ستایشانە زۆر بەجدی وەر ئەگرت ئــەو ڕیپۆرتاژانــەی ڕۆژنامــەكانیش لەســەریان ئەنوسیم بەجۆرێك بابیان كردبووم خەریك بوو ئەمدا لەشەقەی باڵ ئەمویست زۆر بەپڕتاو خۆم بگەیەنە ماڵ و بە "هیلدا"ی هاوسەرم بڵێم : ها ... تۆ بەچ بلیمەت و هەڵكەتویەك شوت كردووە...؟

هەركاتێ لەكارێكی نوێدا دەسبەكار ئەبم ، ئەو هێندە لەو كــارەدا پشــت ئەستورم ئەكات ، هانم ئەدات ، وورەو توانام پێ ئەبەخشێت ، خۆیشم پێم ســەیرە ، بەلاَم زو زو بەئاگام دێنێتەوەو دەڵێت: لەم ســتایش و پیــا هەڵدانانــەت نابێــت بایی بیت ، گەرناتەوێت گوێگرانت پەرتەوازە بێ ، پێویستە زەمینەی زانیــاری و ئاگاییەكانت فراوانتر بكەیت ، جارێك بوبۆنەی دانانی بەردی بناغــەی پرۆژەیــەك وتەیەكی پاراووم پێشكەش كرد هێنــدە لــەو پێناســەو دەربڕینــەی خــۆم ڕابینــی وامزانی دوای "ویلیم"ی وتە بێژی ناودار ئیتر من دووەم كەســم بەسەركەشــی و بایی بونێكی تەواوەوەبەرەو ماڵ چومەوە داستانی ئەم سەركەوتنەم بــۆ گێڕایــەوە خاڵە گرنگ و سەرنج ڕاكێشەكانی خۆمم بۆ دو پاتكردەوە چاوەڕوان بووم ئــەویش دەسبەجێ دەست بكات بەپیاهەڵدان ، كەچی زەردەخەنەیەكی بۆ كردو وتی:

● زۆر چاكە ، ئەدی ئەوانەی ئەیانویست ئەو تەلارە گەورەیــە بونیــاد بنــێن چۆن لەبەر چاویان ناگری...؟ بەڕای من ئەوان شایانی ســتایش كــردنن

نەك تۆ چونکە تۆیش تەنها ستایشی کارەکەی ئەوانت کردووە ...!
ئیدی بایی بوون و هەراو هاوارەکەی من وەك کەفی سابون ڕۆشت ،
سەرنجم لەخۆمدا چەندە سەرکەش و خۆ پەسەندم ، بەهۆی وردبینی و
ئەوینداری ژنەکەمەوە لە ئەنگییەکی گەورەی ڕەوشتی کەدەبێتە
کۆسپی سەرکەتن دەرباز بووم .

خاتو "هاینزو جانسون و بورن استو " زانییان چۆن ڕەفتاروهەلسوکەوت لەگەڵ
مێردەکانیاند بکەن تا ببنە مایەی ئابڕو مەندییان ، هەر ژنێکیش توانای ئەمجۆرە
مامەڵە کردنەی هەبێت سەرەنجامی مێردەکەیشی دیارە هەر سەرفرازییە .

## ١٨... پياوانى دەربەدەر
## بۆچى پياوان خانە بێزارن...؟

خۆرهەلاتييەكان شارستانى ومێژوى ژيانى خانەوادەيان لەخۆرئاواييەكان كۆنترەو كەشى خانە لەكەش و فەزاى كۆمەڵ بەجودا ئەزانن ، بەبيروڕاى ئەوان ،ماڵ حەرەمى ئاسايشى ژن و پياوە .

تەنانەت لە مەسايلى حقوقى و جەزايى و قەزايى ؛ خانەوادە حورمەتێكى هێندەى هەيە دايك و باوك ئەتوانن پەناى جگەرگۆشە تاوانكارەكەيان بدەن بەرپەرچى ياساش بدەنەوە و ژيانيشيان پارێزراو بێت ، ئەم فەزايەش بەمەرجێ پەناگەى ئەندامانى خێزانە كە هاورازى و گونجاندن و لێك گەيشتن بالادەست بێت.

خاتو " دوروتى ديكس" يەكێكە لەپسپۆڕانى كۆمەڵناسو تايبەتمەندى لەبوارى خێزانيدا هەيەو لەيەكێ لەرپۆرتاژە پەسەندكراوەكانيدا ئەڵێت :

بەختەوەرى پياو لەژن هێناندا ...وابەستەيى تەواوى لەگەڵ مامەڵەو رەفتارى ژندا هەيە ....

ئەو لەدرێژەى راپۆرتەكەيدا ئەڵێت:

(... زياتر پياوان بەهۆى ئەوەى ژنەكانيان بەبەردەوامى دڵيان سارد ئەكەنەوە جورئەت و پياوەتييان لەدەست ئەدەن ؛ ئيدى لەهەوڵ و تەقالاى رێگەى سەركەوتن دەستيان ئەشۆن،ئومێدو هيواو ئارەزوى ئەو پياوانە لەژێر كاريگەرى رەخنەى ئەشياو و گاڵتە جاڕو ئازار دەرى ژنانەوە بەرەشبينيەوە ئەگۆڕدرێ و

دەبنە قۆچی قوربانی ئاکاری ژنەکانیان ، بەردەوام پرتەو بۆڵەیان دێت و، بۆ وەك مێردی فلانەکەس نابێتە خاوەنی پولو پارە یان وەك فلانە کەس نابێتە نوسەر ، ئەو کتێبەکەی هەر لەکرین نایەت..! یان بۆ نابێتە سەرۆکێکی ئیداری ،...هتد تا دێت دەبێتە ئاگرو بەرنەبێتە گیانی حەزو ئارەزوەکان و ئەیانکاتە مشتێ زوخاڵ ...!

شوێنەواری شومی بۆڵەو پرتەی ژن ،بۆ بەدبەختی خێزان هەزاران جاربەدترە لەدەسبلاوی و نامالداری و بێهەستی بەرامبەر پیاوەکەی ، گەربڕواشم پێناکەیت سەرنجێکی ئەم لێتوێژینەوە زانستییە "لویس ترمان " ی دەروونناسی ناودار موتالای وردی لەسەر ژیانی زیاتر ١٥٠٠ خێزاندا هەیە و دەرەنجامی ئەزمونەکان بۆیان دەرخستووە کە (... پیاوان ، بۆڵە بۆڵ کردنی ژن بەکوشندەترین و گەورەترین ئەنگی و شورەیی ئەزانن ...)
"گالوپ پول" دەروونناسێکی دیکە ، دۆزیوەتەوە ئەڵێت : پیاوان بۆڵەبۆڵی ژنان بەشای هەموو ئەنگی و شورەییەکان ئەزانن .
"جونسون" پسوری ئەخۆشیە دەرونیەکان لەتاقیکردنەوەکانیدا گەشتۆتە ئەو ئەنجامەی هیچ خەسڵەتێك بەئەندازەی بۆڵەبۆڵی ژن کاریگەری لەسەر بەدبەختی ئەو خێزانە نییە ، هەرلەو ساتەی ئادەمیزاد لەئەشکەوتەکاندا ئەژیان، ژنانێك هاوسەریان بون و ئەیانویست بەبۆلەو پرتە بەسەر مێردەکانیاندا زاڵ بن .
مێژو ئەڵێت :

سوقراتی فەیلەسوف و حەکیمی یۆنانی لەدەست ژنی نالەبار هەڵهاتوو سەری خۆی هەڵگرت لە ژێر دار چنارەکانی ئەو دەشت و کێوەدا سەرگەرمی تەواوکردنی زانیارییەکانی بوو، کەسێتییە ناودارو گەورەکانی وەك " ناپلیۆن"ی پادشای ـمێیەمی فەرەنسا و "ئیبراهام لینکۆلن" سەرەك کۆماری ئەمریکاش

هەمانشێوە بەدەست بۆڵە بۆڵی ژنەوە هەراسان بوون ، "سیزار" سەردارو نوسەری رۆم لەژنەکەی جودا بویەوەو تەلاقیدا، تەنها بەوهۆیەی بەرگەی کەچرەفتارییەکانی نەوی نەدەگرت .

نەو ژنانەی پێیان وایە بەکەچ رەفتاری و بۆڵەو پرتەکردن بە سەر پیاوەکانیاندا نەسپی ناواتیان لەنگ بدەن، بێگومان بن سەرەنجامێکی ناهەمواری لێدەکەوێتەوە .

هاورێیەکی دێرینم ووتی:

هەرکاتێ دەستم نەدایە هەر کارێك، ژنەکەم هێندە نەو کارەی بەسوك سەیر نەکردونەیکردە گاڵتەجارِ..نزیك بوو نومێدی کارکردنم لەدەست بدات و بەتەواوی بەد بەختم بکات، هاورێکەمان دەستی بەکاری فرۆشیاری کردبوو، نەو هێندە حەزو نارەزوی نەو کارەی هەبوو دڵنیا بوو لەوەی سەرکەوتن نەبێتە چارەنوسی ، کەچی شەوانە کە بەرەو ماڵ نەگەڕامەوە ، ژنەکەم بەم وشانە پێشوازی لێنەکردم .. چاکە ، هەواڵی کاکی هەڵکەوتوو چۆنە ، پارەو پولێکی دەسکەوتووە ، یان دەنگو باسێکی سەرۆکی بازرگانەکانی بۆ هێناوین ، ها ..بیرت نەچێ نەم هەفتەیە بێتەوە نەبێ کرێ خانوو بدەیت ، نەم حاڵە چەن ساڵێکی خایاند چالاکی و ترۆقی نەم کابرایە تەنها لێهاتویی و کارامەیی خۆی بوو ، نەمرۆش بریکاری گشتی یەکێ لەکۆمپانیا ناسراوە نێو دەوڵەتییەکانە بەلاّم، سەبارەت بەژنەکەی ... هەڵبەت تەلاّقی داوە، هاوسەری لەگەڵ ژنێکی دیکەدا کردووە ، دیارە ژنێکی سەنگین و سەلار سەراپای لەئەویننداری و خۆشەویستی و رێزدا تواوەتەوە بەلاّم ژنی پێشوی نەزان و کاڵفام و بویەهۆی لەدەستدانی مێردەکەی و نەڵێت : نائەمەیە وەفای پیاو ، دوای چەندساڵ دەسکورتی و هەژاری بۆژنێکی جوان دەسبەردارم بوو لێیداو رۆشت...لبەلێ

پیاوان هەروا بێوەفان هەرکە بەنانی خۆیان گەیشتن و پێویستیان بەژن نەما ئیدی بەرەڵای ئەکەن ...!

گەربلێیت : بێگومان بۆڵەو پرتەی ئەم ژنە وای لەو پیاوەکردە تا لێی جودا بێتەوە، لێرەدا جێی متمانەی کەس نییە، بەلام بەدڵنیاییەوە هۆکارە سەرکییەکەی تەنها ئەو خەسلەتە دزێوەی بوو .

پاشان هاورێیەکی نەوجەوان ئەڵێت : منیش گرفتاری هەمان دەردم ژنەکەم لەبری هاندان و پشتەسورکردنم هەردەم سەرزەنشتم ئەکات .

ئەو بەهۆی لۆمەو سەرکۆنەکردنی ژنەکەیەوە دەرون و مێشکی توشی ئالۆزی بوون بەجۆرێك خۆی دانی بەوەدا نا کە هەستی بڕوا بەخۆبوونی لەدەستداوە، دیارە بۆڵەی ئەم ژنە نالەبارە وەك دلۆپەی چۆرێك ئاو کەتاشەبەردی گەورە تابناغەکەی کون ئەکات هەمانشێوەیە کابرای بەدبەختکردووە،تابەیەکجاری کارەکەی پێ لەبەرچاو خست و ئیرادەی لەدەستدا، خۆشبەختانەش بەمەرامی جیا بونەوەو تەقی خۆی گەیشت، کابراش دوای تەلاقدانی ئەو وێنەی ئەخۆشێکی تازە سەرپێ کەوتوو ڕۆژ بەڕۆژ تین و توانای لەدەسدراوی وەبەر ئەهاتەوە، سەرلەنوێ بڕوا بەخۆ بوون و ئیرادەی بۆ ئەگەڕایەوە ئێستا کاری زۆر لەجاران چاکترو چالاکترە.

یەکێ لەترسناکترین جۆرەکانی بۆڵەبۆل ئەوەیە ژنەکە بەشێوەیەکی نەشیاوو ناپەسەند بەراوردی مێردەکەی بەکەسانی دیکە بکات، بۆ نمونە بڵێت : تۆ بۆ ناتوانی پارەی زیاتر بەدەست بێنی ...؟ ئەوەتەی تۆ پلەو پایەت بەرز بۆتەوە هیچت دیار نییەونەوەتا فلانە کەس سێ بەرامبەری تۆ دەوڵەمەندترە .
یان چونکە براکەم ڕێچگەی پارە پەیدا کردن شارەزایە ئەتوانێ هەرچی جوان و گرانبەهایە بۆ ژنەکەی دابین بکات ، کەچی تۆ تەنها بژی و مەمرە ، بەسکێ

تێرو بەدە برسی، یان ئەگەر ژنی فلان كەس بومایە ئێستا لەچ نازو نیعمەتێكدا ڕامنەبوارد، ئەمانەش لەگوللەو چەقۆ بەزامدا كردنی پیاو دەردناكترە، سكاڵا كردن، ئاهوناڵە، بەراوردكاری،سوك سەیركردن و گاڵتە جاڕی، بەدوای قسەو قسەلۆكدا چوون و چاو لێكەری لەجۆرەكانی بۆڵەو پرتەدا هەژمار ئەكرێن.

بۆڵەو پرتە وەك مادە تلیاكی و سەركەرەكانە خواردنیان مەترسیدارەو نەخواردنیشیان مەحاڵ ...!

پیاوێك دوای بیست و پێنج ساڵ دەردەسەری و كاری سەخت و ناهەموار بیەوێت خانویەك بكڕێت چەند تامەزرۆیە ، كاتێ ئەیكڕێت و ئەچنە ناوی خانی ژنی دەست بكاتە بۆڵەو بڵێت : ئەی بۆ خانویەكی وەك فلان و فیسارت نەكڕیوە، دیارە ئەم ژنە بەنەخۆشییەكی درێژخایەن موبتەلایە هیچ شتێك نابنە جێگەی ڕەزامەندییەكانی، مێردە بەدبەختەكەشی لەبڵێسەی ئاگری بەدڕەوشت ئەم ژنەدا ئەسوتێت...!

دەگمەنیش ڕێبكەوێت ژن و پیاو لەژیانی هاوسەرێتییاندا جیاوازی هەنوكەییان نەبێت، ژن و پیاوی گونجاویش بەدەر نین لەم جیاوازییانە بەڵام هێندە بەتین نییە بێتە هۆی لێكدابڕان و جودا بونەوەیان.

پرتەو بۆڵەی بەردەوام و بێ سنور دڵ و دەرونی بەختەوەرترین پیاو ماندوو بێزار ئەكات، پیاو هەر هەوڵو ماندو بونێك بۆ سەرخستن و بەرەو پێش بردنی چارەنوسی كارەكەی بدات، كەشەو ئەیەوێ بچێتەوە بۆلای ژنی كەچرەفتار وەك ئەوە وایە كای بێدان بكوتێ، بێگومانماڵیشی لا ئەبێتە گۆڕستان.

پرۆفیسۆر "سمویل استییون سن" لەزانكۆی ڤیرجینیا، وتەیەكی پێشكەشكردو دوپاتی ئەوەی كردەوە وخوازیاری چوار ئازادی بوو بۆ پیاوان :

ئازادی لەبۆڵەو پرتەی ژن

ئازاد بون لەشۆفێری کردن بۆ ژن

ئازاد بون لەو جلە پیسانەی لەرۆژێکی ماندوێتیدا بەرەو ماڵ ئەچێتەوە

ئازاد بوون لەتێکچونی کۆ ئەندامی هەرس

مەبەستی سەرەکیشی ئەوەیە ئەو خواردنەی ژن لەماڵدا ئامادەی ئەکات پێویستەت پاکو خاوێن و ئیشتیها داربێت، شیاوی زو هەرس کردن بێت.

زۆرجار پرتەو بۆڵەو کەچڕەفتاری دەبنە هۆی سستی تەمەڵی لەش، هەروەك چۆن وتویانە :بیرو هۆشی ساغ لەلەشی ساغدایە، شەکەتی و ماندوبونیش لەشێوەی کەچڕفتاری و ڕوگرژیدا خۆیان ئەنوێنن، دەرونناسان پێیان وایە دژایەتی و داخ لەدڵی هاوشانی بەدڕەوشتی و پرتەو بۆڵەدا هەژمار دەکرێن، کینە شاراوەکان پێکهاتەی نارەزایی لەغەریزەی جنسی، بێبەش بوون لەعیشق و خۆشەویستی ، نارەزایی درێژخایەن لەبارەی ژیانەوە ، پەرچە کرداری ئەم هۆکارانە بەشێوەی سکاڵاو گلەیی و پرتەو بۆڵە لە ژندا دەرئەکەوێ.

ڕێگەی ڕاستیش ئەوەیە ژن لەڕوانگەی دەرونناسییەوە خۆی شیکار بکات، بیزاری ونابەدڵییەکانی ڕاستەوخۆ بەمێردەکەی بڵێت و گرێکوێرەکانی ناخی خۆی بۆ باس بکات ئەوکات بەهاوکاری ئەو هەوڵی بنەبڕکردنی بدات، چونکە بیانو گرتن نەك تەنها دەردی چارە ناکات بگرە گرانتری ئەکات، تەنانەت لەکارو بارە قەزاییەکانیشدا تاوانەکان بەهۆی بۆڵەو پرتەوە ئەنجام ئەدرێن .

پێکراو "بریندار" یان کوژراو ، ئەوەی تاوانەکەی بەرامبەر ئەنجامداون حوکمەکەیان ئاسانترە،لەم دواییانەدا یەکێ لەپەیامنێرەکانی "ستوکهولم"سەردانی بنکەی دۆسییەکانی تاوانی ئەو وڵاتەی کردو لەگوزارشەکەیدا وتی: بەپشت بەستن بەوەی ئەو کوشتارانەی پێشتر بکوژ بەرنامە ڕێژی بۆ کردوون ، دەردەکەوێ

كەسی كوژراو كەسێكی بەدخو كەچ ڕفتارو بۆڵە بۆڵچی بووە، هەربۆیە ئەو كوشتنە بەكوشتنێكی نائەنقەست دائەنرێ.

دیوانی دادگاییە گەورەكانی شاری جۆرجیا لەبارەی سكاڵای ژنێكەوە لەدەست مێردەكەی هەمیشە لەژوری میوانداری گۆشە نشینە دەرگای لەسەرخۆی داخستوە ڕایگەیاندنەو داواكارییەی ژنەكە پێشكەشی دادگای كردووە ڕاست نییەو پشتی پێ نابەسترێ ، چونكە پیاوێك لەتاو بەدخویی ژنەكەی پەنا بەرێتە بەر گۆشە نشینی نابێت لۆمەو سەرزەنشت بكرێت.

قازی وتی: لای پیاو ژیان لەكەلاوەیەكدا خۆشترە نەك لەكۆشكێكداو لەگەڵ ژنێكی بەدخو....!

قازییەكی بەریتانی مۆڵەتی تەلاقی دایە پیاوێك كە ژنەكەی هاوسەرێتی لەگەڵ پیاوێكی دیكەدا بكات بەڵام ٧٠٠٠ دۆلاری باجی زیانی پیاوەكەی دابەزاند بۆ ٢١٠٠ دۆلارو دوپاتی ئەوەشی كردەوە بەهای ئەم ژنە بەهۆی ناسازیی و سەرپێچییەوە ساڵ بەساڵ دائەبەزێت، چەند سوكی و ڕسواییە پیاوێك لەدادگا بەقازی بڵێت: جەناب ڕزگارم بكە لەدەست ژنەكەم، چونكە ساڵانێكە لەگەڵمایەو كەسێكی نەسازو نەگونجاوەو بایی پولێكی قەڵب نرخی لەلام نییە..! ئەوا من لەكانگای دڵەوە بێ هیچ مافێك ئەوم لەخۆم جودا كردەوەو بەرەڵام كرد...!

هەندێك پیاو ، نە تەنها بەبێ بژاردنی مافێك واز لەژنەكانیان دێنن بەڵكو برە پارەیەكیش ئەدەن تاكو لەبەدخویی و كەچ ڕەفتارییان ڕزگاریان بێت.

لەیەكێك لەژمارەكانی ئەم دواییانەی نیویۆرك "ورلد تلگرام"دا خوێندمەوە ... پیاوێك سێ كەسی بەكرێگرتوە تا ژنەكەی بۆ بكوژن، كاتێكیش هۆكاری ئەمەیان لەپیاوەكە پرسی بوو، لەوەڵامدا وتبووی :تەنها لەبەر كەچڕەفتاری بۆڵەی بەردەوامی ئەو كارەم ئەنجامدا، ئێستا دەركەوت بەدڕفتاری و بیانو گرتنی ژن

گەورەترین ئاستەنگ و لەمپەری ڕێگەی ترۆقی ژیان و کارو چالاکی پیاوە، ئایا ڕێگە چارەی ئەم نەخۆشییە چییە...؟

دیارە گەر ژنی بیانو باز لەکەمو کورتی خۆی بەئاگا بێت لەڕاستیدا بیەوێت خۆی چارەسەر بکات، ئەوا کارێکی ئاسانە، هەرگیز ناتوانن تیماری دەردێك بکەن ، تادەردەکە دەرنەکەوێ ...!

بەوتەی حەکیمان : دۆزینەوەی نەخۆشی نیوەی چارەکردنە، بۆڵەیش یەکێکە لەکوشندە ترین نەخۆشییە دەروونییەکان، گەر ئێوەش بەگومانن لەوەی موبتەلان بەو دەردە یان ...نە ء ...ئەوا پرسیار لەمێردەکانتان بکەن، بەمەرجێ کە ڕاستییەکەی درکاندلێی سود مەند بن .

یەکەم :

کۆمەك لەپیاوو ئەندامانی خێزان بخوازە، بەڕاستی داوایان لێبکە هەرکاتێ توڕەو بەدخو بویت، ئەو کاتە سزایەك بدرێیت، هەڵبەت لەسەر ئەوە جەخت بکە شان ئەدەیتە ژێر باری سزاکە .

دووەم:

واخۆتان ڕابێنن تەنها یەکجار باس لەشتێك بکەیت پاشان فەرامۆشی بکەیت، گەر شەش حەوت ڕۆژ جارێك بەمێردەکەت بڵێیت : بۆ باخەکە پەرژین ناکەیت ...؟بێگومان ئەو نایەوێ ئەو کارە بکات ، دوبارە کردنەوەی جگە لەخۆ ماندوو کردن هیچی دیکەی نییە ، بۆڵەکردنیش داواکارییە قێزەون ئەکاو کابراش شێلگیرتر نەبێت .

سێیەم:

هەوڵی ئەوەبدەن بەزمانی شیرین مەرامتان بێننە دی، ئەم ئەستەقم لەدایە گەورەمەوە بیستوە ..بەشەکرو شیرینی زیاتر مێش و مەگەز لەداو ئەکەون تاکو

سرکە ...!

ئەم وتەیەش ئـەمرۆ بەڕاسـتی دێتـە دی، کاتـێ ئەتانـەوێ مێردەکـەتان کارێك ئەنجام بدات بەزامانی شیرین بدوێ.

چوارەم :

زەمینـەی ڕەوشـت و مرۆڤایـەتیت بـەرەو بـاڵا ببـە، ژنـی بەڕەوشـت و هۆشمەند، نەشیاوە هەنوکەییـەکان بـەدیناکات، واتـە چـاو پۆشـییان لێئـەکات، هەندێك ژن هێندە مێشکی خۆیان بەهەنوکەییەکانەوە جەنجاڵ ئەکـەن کەشـایانی هیچ نین ، نمونە : بۆچی بەیانیان مێردەکەی خـاولی دەمـو چـاو وشـك کردنـەوە ناکاتەوە بەجێگەکەی خۆیدا ....!

ئایا هیچ ژنێ ئامادەیە کراسە کۆنێك بەنرخی کراسێکی زەڕباو بکڕێت ....؟ بەڵام بەدبەختانە، زۆرمان نرخی کراسێکی زەڕباو ئەدەینە کراسە کۆنێك ...لورەو توانامان لەدەست ئەدەین، چڵك و تۆز ئەخەینە سەر ڕوخسـارمان بـەدادو بێـداد کردن خۆمان لەقۆناغی پیری نزیك ئەخەینەوە، سەردەمی عیشق و خۆشەویسـتی ئەگۆڕینەوە بۆ ڕق و نەفرەت بۆچی مێردەکانمان جلـەکانی خـۆی یـان خاولییـەك هەڵناواسێتەوە، ئایا بەهای ڕازاوەیی ، جـوانی تەندروسـتی خۆشـی و ئاشـتی و تەبایی ماڵ یایی ئەو چرکە ساتە نییە خۆمان جلەکانی تێدا هەڵواسین ..؟

پێنجەم:

بیزاریی گلەییەکانت بەنەرمی دەربـڕە، هەرشـتی کاتـت لێ تـاڵ ئـەکات دەبێتە هۆی پەرێشانی و بێزاری، لەسەر پارچەیەك کاغەز بینوسەو ئارام بگرە تا دەکەونە دنیای ئاسودەیی و ئـارامی ئـەوجا سـکاڵات دەربێنـەو لەبـەر خۆتـەوە بیخوێنـەوە ، ئـەبینیت هێنـدە سـکاڵاکەت لەبـەر چـاو گچـکەیە لـەدەربڕینی شەرمەزاریت ، بەڵام کاتێ سەبارەت بەگلەییـە گـەورەکان، هەوڵئـەدەیت پتـەوو

لۆژیكیانە بدوێیت، بێگومان بە بەهاوكاری پتەوو پەیوەندی دوقۆڵی گلەییەكانت لەبەین دەچن .

شەشەم:

هەوڵی ئەوە بدە بێ گرژ بوون بگەیتە مەبەست، زیاتر موتالآی زانستی پەیوەندییە كۆمەڵایەتیەكان بكە ، لەرێگەی ڕوخۆشییەوە مێردەكەت هانبدەیت بۆ ئەنجامدانی كارێك نەك بەرەقی و جەخت و فشار، بەوتەی " چارلز شواب"گەورەترین پسپۆری زانستی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان ، ئیلهام چاكترین ڕێگەی نێوان ژن و مێردایەتییە، ئەوەش بزانە ئەم وتەیە لەزاری پیاوێكەوە ڕەها بووە كە لەبواری ئیلهام كردن بۆ خەڵكی ساڵانە ملیۆنێك دۆلاری دەسگیر بووە, هەروەك وتویانە : بە تفەنگ ناتوانرێ ڕاوی پیاو بكرێت, كەواتە بەدخویی و ڕو گرژی ناتوانێ بەسەر پیاودا زاڵ بێت، بەدكرداری و پرتەو بۆڵەش ناستەنگ و لەمپەری پیاوە هۆكاری شكستی دەرونییەو بەدبەختی ڕۆژ ڕەشی ژنیشە ...!

## ١٩ دەستێوەردانی نا بەجێ لەكاروباری پیاودا

مرۆڤ بەشێوەیەكی سروشتی خوازیاری سەربەخۆیی و ئازادی كارو پیشەكەی خۆیەتی ئەم هەستەش لەپیاودا زیاتر رەنگی داوەتەوە, لەمباسەدا هەندێك لەنارەزایی پیاووم باسكردووە، تازیاتر سەرنج راكێشەری خانمان بێت، لایەنە سلبیەكەشی ئەوەیە خانمان دەسخەرۆی ئەوە نەبن كەدەستێوەردانی خێرخوایانە هەمیشە بەقازانجی پیاو بشكێتەوە، لێوردبونەوە لەكاری پیاو مەسەلەیەكی ئێكجار ئالۆزەو كەمتر خانمان بتوانن لەهۆكارە دەرەكییەكانی بەدووربن، یان كارەكە بگەیەننە ئەوەی چۆنیان بوێت بەو مەبەستە بێتە بەر، لێرەدا لەبارەی دەستێوەردانی نادروستەوە بەئەنقەست ئەم بابەتەم دواخست تا خانمانی وریاو زرنگ بەپێچەوانەیەوە مامەڵە بكەن، وەبیرهێنانەوەی ئەو خاڵەش پێویستە بزانن پارێزگاری و رێنمایی پیاو لەگەڵ دەستێوەرداندا جیاوازییەكی گەلێ زۆری هەیە لەگەڵ دەستێوەردان .

خانمی بەرێز سەرنج بدە گەر پیاو بەهەرمەبەستێك نیازی دەستێوەردانی كارو بارتانی هەبێت بێگومان مایەی بێزاریتانە، بەڵام پیاوان پەیوەندی بەرفراوانتریان لەگەڵ دەرەوەی ماڵدا هەیە مافی خۆیانە لەدەستێوەردانەكانتان زویر بن .

چاو پێكەوتنێكم لەگەڵ بەرێوەبەری یەكێك لەكۆمپانیا گرنگ و پێشینەدارەكانی ئەمریكادا ساز كرد لەمەر بۆچونەكانی لەبارەی كۆمەكی ژن بۆ پێشرەوی كاری پیاو، ئەو لەوەڵامدا ووتی(... من پێم وایە هەر ژنێك بەرەچاو

کردنی دوخاڵ ئەواتوانێ بێتە هـۆی ترۆقـی و پێشخسـتنی کـاری مێردەکـەی، کۆمەکی گرنگ و شایانی وردبینی ئەنجام بدات:

یەکەم . ئەوی لەناخی دڵەوە خۆش بوێت

دووەم. لەکارەکەیدا ئازادو سەرپشکی بکات

ژنێك مێردەکە لەکانگای دڵەوە خۆش بوێت دیارە هەوڵی ئەوەشـی بـۆ ئەدات ماڵەکەی بۆ بکاتە لانەیەکی ئـارام بـەخش، وەهـا ژنێکـیش مێردەکـەی لەکاردا ئازادو سـەر پشك بکات هەرگیز نابەجێ و نەشیاوانە دەستوەرناداتە کارو باری،ئەوکاتە هیچ بیانویەك نییە، مێرد تا ئەو شوێنەی بۆی ئـەلوێت و لـەبواری کارەکەیدا پێشڕەوی ئەکات.

لەم دەستێوەردانە مەبەستم ئەوە نییە ڕاستەوخۆ ژن لەکارو بـاری ئیـداری پیـاوو هاوکارانیدا هێندە کەوچکی ناو کاسە نەبێت .

بەڕێوەبەر ووتی:ژنێك هەمیشە پەندو ئامۆژگـاری بەپیاوەکـەی ئەدات،هەمیشـە دەست لەکاری وەرئەدات ئەو لەدژی هاوکارەکانی هەڵئەنێت لەدەست کەمدەراتی و گرانی ئەرك و زیادکارکردن لەسنوری خۆی سـکالآیەتی، بێگومـان بـەم کـارە مەترسیدارانە هۆکارەکانی بێکاری ئەو فەراهەم دێنێ، زۆریش لـەخانمان حـەونی زێڕین بەوەوە ئەبینن مێردەکانیان بەپێی ئەو نەخشە داڕێژراوە بگەیەننە پلەیەکی باڵا ئەویش بەپێشنیار کردنی ڕشتەیەکی زانایانە وەك لەبەر چـاو شـیرین کردنـی کـار، بونـە هـاوڕێ لەگـەڵ هاوکـارە ئیدارییەکانیـدا، بـەڵام مـەخابن زۆر جـار کارپێکردنی ئـەم نەخشـانە لـەبری ئـەوەی مەبەسـت بپێکێـت دەبێتـە مایـەی دەرپەڕاندی کابراو بیکارو بیچارەو سەرگەردانی ئەکەن، من بەچاوی خۆم ڕودانـی ئەمەم بینیوە..

سەردەمانێك لەسازمانێكی بچوكدا كارم نەكرد، سەرۆكەكەی خانەنشین و بریكارێكی هەبوو، ئەم كەسە زۆر بەسەلیقەو جدی بوو لەهەموو روپەكەوە شایانی پۆستی بەڕێوەبردن بوو، هەرلەدوای دەسبەكاربوونی كابرا دەسبەجێ ژنەكەی لەئیدارەكەی ئامادە بوو، كارمەندەكان هەموو سەرسام بوون ، ئەو هەمو رۆژێك لەگەڵ مێردەكەیدا ئەهاتە سەركارئەو نوسراوانەی پێویست بوو دیكتە بكرانایە، ئەو ئەیكردن،تا وای لێهات گشت نوسراوەكانی ئەرشیفەكەی سەر لەنوێ بەسەلیقەی خۆی رێكخستنەوە، لەوانە ئەمەت پێ شتێكی خەیاڵی بێت...؟ بەڵام بڕوا بكە ڕاستە،باری دەرونی ئەندامان وردە وردە بەرەو دارمان چوو، چونكە هەرلەهەفتەی یەكەمدا خانمی دیكتەچی حەوسەڵەی كاركردنی نەماو دەستی كێشایەوە،بەدوایدا ئێمەش پشتمان سارد بویەوە واتە درەنگ نەهاتینە سەركارو زو بۆی دەرئەچوین, زیاتر لەسێ هەفتە بەسەر دەسبەكار بوونی سەرۆكی نوێدا تێپەڕی نەكردبوو سەرۆكی گشتی ئاگاداری دەست لەكار كێشانەوەكەی دابەنێو چەوانیدا, ئیدی كابرا هەرهێندەی پێكرا لەگەڵ خانمەكەیدا دو بەدو تێیان تەقاند، كەواتە جۆرە دەستێوەردانێكی لەم ڕەنگە لەلایەن ژنەوە گەمەیەكی ترسناكەو بەدبەختی پیاوی لەئەستۆیە .

هاوڕێیەكم ووتی:یەكێك لەگرنگترین بەڕێوەبەرە گشتییەكان جێی ڕێزو نەوازشی گشت لایەك بوو،بەناچاری دەستی لەكار كێشایەوە، تەنها بەهۆی نەتوانینی لەبەرهەڵستی كردنی دەستێوەردانی خانمەكەی لەكارو بارە ئیدارییەكاندا، ئەو بوبویە چاودێری كابراو وەك ئەندامی باندێكی سیخوڕی چالاكییە نهێنیەكانی ئەنجام ئەدا.

بەڕێز گەر خوانەکردە لەپێڕی ئەمجۆرە ژنانەیت بڕوات بەچاودێری کردنی نهێنی هەیە ئەوا بزانە ڕێیەکت لەبەر گرتووە دەبێتە هۆی ئیفلیجی بیرو هۆشی مێردەکەت.

## ڕێنمایی

☜ یەکەم :

گەرلەگەڵ هاوکاری مێردەکەتدا بێشەرمانە ڕەفتار بکەیت، کارێکی وا بکەیت پەیوەندی پێتانەوە نەبێت، بزانە کارێکی چاکت نەکردووە، ئەو کەسێکی پاکو بێگەردەو، کینە دوژی لەگەڵ کردنی دەبێتە یەکەم هەنگاوی دەستێوەردانەو ئاستەنگێکە·کەمێردەکەت نەتوانێ بەخەیاڵی ئاسودەوە هاوکارێکی باشی هەبێت و بێتە جێی متمانە پێکردنی.

☜ دووەم :

ڕۆژانە چەندین جار پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵدا بکەیت، هەررووداوێکی گچکەو هەنوکەیی ڕویدابێت دسبەجێ پێی ڕابگەیەنیت، تا دزە بکەیت بۆ ئەوەی بزانی کێی لەلایەو لەگەڵ کێدا نان ئەخوات یان کێ لەژورەکەیدایە .

☜ سێیەم :

ئیرەیی بەریت بەهاوسەری یەکێك لەهاوکارەکانی، ئەنجامی ئەم بۆچوونە ڕوداوی خراپی لێئەکەوێتەوە .

☜ چوارەم :

هەمیشە ئەوەی بۆدوپات بکەیتەوە، مافی کەمەو کاری زۆرە، ئەو خزمەتەی ئەو ئەیکات بەهایەکی ئەتۆی نییەو تەنها تەنها ماندوبونی بۆ ئەمێنێتەوە بێگومان درەنگ یان زوو ئەویش دڵی لەکار سارد ئەبێتەوە.

☜ **پێنجەم :**

فێری بکەیت چۆن بەزمانی لوس مەرایی بۆکەسانی لەخۆی پلە بەرزو گەورەتر بکات، بەمەکرو نازی ژنانە خۆی بەرێتە پێش، دوایش پێی بڵێت ئەو تەنها ڕاپەڕێنەری فەرمانەکانی ئێوەیە...!

کاری ئەو تەنها باربەرییەو، ئەخشە کێش و ڕاوێژکارو بەڕێوەبەری گشتی تەنها ئێوەن ...!

▪ **شەشەم:**

بەمیوانداری و پێشوازی گران هەمیشە دوچاری قەرزاری بکەن، گەر خوانەکردە سکاڵاو گازندەیەکی دەربڕی دەسبەجێ هەڵپرژێنەوە بەرویداو بڵێن مەرجی ترۆقی خۆدەرخستن تەنها خۆ نواندنە ...!

▪ **حەوتەم:**

لەماڵدا دەسگایەکی سیخوڕی فێلبازانە بسازێنی ، هەوڵی دەرخستنی مامەڵەو ڕەفتاری لەفەرمانگە لەگەڵ ژن و پیاوەکانی هاوکاریدا چۆنەو , هەوڵی دەرپەڕاندنی هاوکارانی بدەیت، چونکە لەگەڵ ئەواندا بەڕێزت دژایەتییەکت هەیە و دەستوری گواستنەوەی مێزی کارکردنەکەیشی بۆگەنجینە دەربکەیت ...!

خانمانی بەڕێز :

گەر ئەتانەوێ هەمیشە مێردەکانتان خەونی پێشکەوتن و خۆشی و کامەرانییەکانی بەدوو چاو ئەبینێ، ئەوا بەو خاڵانەی سەرەوە مامەڵە بکە تا لەگەڵ دەردەسەری و ئەگبەتیدا دەس لەملان بن ...!

## گۆڕینی ڕەوشی پیاو هەمیشە لە بەرژەوەندیتان نییەو هەرکەسەو کاری خۆی...!

بێگومان تایبەت مەندییەکانی ڕەوشتی و جەستەیی هەموو کەسێك چون یەك نین بەپێی لێتوێژینەوەو وتەی زانایان لەتەواوی دەرکەوتن و کامڵ بوونی ژیانی مرۆڤدا نەتوانراوە دوکەس تەنانەت _ دوانەیش بدۆزرێتەوە کە لە ١٠٠٪ لەیەکتری بچن ، هەوڵدان بۆ گۆڕینی ڕوکەش ا لەوانەیە تاڕادەیەك سەرکەوتوو بێت بەڵام گۆڕانکاری لە نێوەڕۆکدا کارێکی نێکجار دژوارو مەحاڵە .

ساڵی ١٨٢٦کاتێ "جین ولش"زەماوەندی لەگەڵ "توماس کارلایل"دا کرد، کۆمەڵێك لەهاوڕیکانی کەوتنە سەرکۆنەکردنی و نەیانووت"جین" قەدری خۆی نەزانیوە شوی کردۆتە پیاوێك شایانی ئەو نییە " توماس" کابرایەکی داماوو توندڕەوەو"جین" کیژێکی جوان و نەرم و نیانە و لەخانەوادەیەکە ئەبوایە کەسێکی هاوشانی خۆی هەڵبژاردایە، لەحاڵێکدا " کارلایل" پیاوێکی عەوام و خێڵەکی دەرنەکەوت کەسێتیەکی دەمارگیرو چەند خەسڵەتێکی سەیرو سەمەرەی هەبوو، ئەو لەماڵ و سەروەت و سامانی دنیا بێبەری بوو، بەڵام لەڕوکەشدا وادەرنەکەوت کەس نەینەتوانی وەسفی بکات، تەنها سەرمایەکەشی زرنگی و بیرو هۆشی لەڕادە بەدەری بوو، بەسەرهاتی شوکردنی "جین کارلایل" بەم کابرا سەرسەختە"اسکتلندی"ە لە مێژوی مرۆڤایەتیدا بۆتە داستان، ئەو هێندە ژیا تا بەتەواوی شانازییەوە بینی مێردەکەی هەڵبژێردرا بەڕاگری دانشگای "ادینبۆرگ"ی لەندەن، ئەو شاهید حاڵی ئەوەبوو "کارلایل" وێنەی پەیکەرێك

بویە مایەی پەرستش و ڕێزو ستایشی گەلی بەریتانیا، سەرجەم خەڵکی هونەرو ئەدەب دۆست شاکاری بەنرخو گرانبەهای وەك کتێبی (کودەتای فەرەنساو ژیانی کرامول)یان بڵاو کردەوە، لەلەندەندا ماڵەکەیان وەك مەیدانێکی پۆلاین سەرجەم هەڵهاتووە بلیمەتەکانی هاوچەرخی لەخۆ گرتبوو، "جین" شاعیرو نوسەرێکی دەسبەکاربوو، بەڵام چونکە ئەیویست گشت کاتەکانی خۆی تەرخانی مێردەکەی بکات، لەنوسەری دەستی کێشایەوە، ماڵ و باوان و شارو شوێنی خۆی واز لێهینا بۆ ئەوەی "کارلای" بتوانێ بەئاسودەیی و ئارامییەوە زەمینە بۆخۆی بسازێنێ لەگەڵ ئەودا بۆ دێهاتەتە دورەکانی خوارووی "اسکتلند" بڕوات.

ئەو ژنێکی گەلێك ماڵداریکەربوو، تەنانەت پینەو پەڕۆی پۆشاکەکانی خۆیشی ئەکرد، تابتوانن بەو دەرامەتە کەمەیان ژیانیان بەسەر بەرن، "کارلایل" توشی نەخۆشی گەدەو کۆئەندامی هەرس بوو، ئەم خەمخۆری و پەرستاری ئەکرد بەو پەڕی ڕوگەشی و سینە فراوانییەوە، کاتێ کتێبەکانی بونە جێی بایەخ و سەرنجی لایەنداراانی "جین" هەوڵیدا ژمارەیان پترتر بکات تا ئامادەیی هونەری ئەو لەچاکی و بڵندیدا بێنێتەوە، ئەو بەوپەڕی لێبوردەییەوە شانی دایە ژێر ئەمبارەو تا مێردەکەی ڕوناکی ئەنجومەنی ژنان و خاوەنی پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بێت، بەرزترین و جوانترین خەسڵەتی "جین" هەرگیز لەهەولی ئەوەدا نەبوو لەکەسێتی "کارلایل" کەم بکاتەوە، ئەو لەیەکێ لەیاداشتەکانیدا کەئەمرۆ لەجیهاندا شۆرەتیان هەیە دەڵێت :

لەبری ئەوەی هەوڵ بدەم ڕەوشتە ناوازەو خەسڵەتە تایبەتییەکانی مێردەکەم لەبار بەرم، هێڵم بەدەوریاندا ئەکێشاو بۆم ڕون ئەکردەوە تا بنەماو ماهییەتی خەسڵەتەکانی بپارێزێت ..!

گەر کەسێکی بەدەرلە"جین" بوایە دیارە لەبەر خێرو چاکەی خودی "کارلایل" هەوڵی ئەدا هەندێ لەخەسڵەتە ناوازەو ڕەوشتەکانی چاکسازی بکات،کەچی " جین " هەمیشە خەمی بەهێز کردنی ڕەوشتە نامۆو سەیرەکانی ئەوی بوو، ئەو هەرگیز هەوڵی ئەوەی نەئەدا مێردەکەی کە مەردی مەیدانی زانست و نوێخوازی بوو بیکاتە قسە خوانێکی ئەنجومەن ...!

مەخابن ئێمە تا ئەو ڕادەیە تێگەیشتوو کامڵ نین، زۆرێك لەپیاوان بیرو هۆشی مێشکیان ئالۆزکاوی دەستی کارگەلێکە لەبڕست و تواناادا نین و ئەمەش تەنها لەبەر دواکارییە گران و قورسەکانی ژن، خوازیاری ئەوەن لەپلەو پایەی نزم و ژێردەستیدا بن نەك لەبەرزی و دەسەلاّت و داماوی دەستی ژن ...!

سەرکەوتن : واتە سەرگەرمبوون بەوکاردوە کەجەستەو دەرون سەرقاڵی ئەنجامدانێتی "اوریسن سوات ماردن" ئەڵێت : من پێم باشترە کرێکارێکی پلە یەکی بالاّخانەیەك بم نەك لەکارێکی بەرزو گرنگی دیکەدا دەسەوسانێکی پلەدوو ...!چونکە کرێکارێکی لێهاتوو کارەکەی دڵسۆزانە ئەنجامبدات باشترە لەخاوەن پلەیەکی گەمژەو بێناگا..! سروشتیش سەرجەمی خەڵکی هێندە تەیار نەڕسکاندووە تا هەموو بەڕێوەبەری گشتی و وەزیرو گزیر بن، بەلاّم بایەخێك ژنان بەناوو شۆرەتی ئەدەن لەوانەیە مێردەکانیان کەمترین بایەخی پێنەدەن یان بەهیچ جۆرێ ویست و خواستیان نەبێت، ژن نارامش و بێدەنگی مێردەکەی بەتەوەزەلی و کەمتەرخەمی دێنێتە هەژمار کردنو هەرکاتێکت زانی ئەیکاتە ئاژاوەو ئەڵێت : بۆ وەك فلاّنەکەس لەهەلپەدا نیت ...؟

ئەم ژنە لێرەدا ئەبێت ئەوە بزانێت مێردەکەی ئەو تواناو لێوەشاوەیی باری کۆمەلاّتی و بازرگانی و زانیاری فلاّنەکەسی نییەو ناتوانێ بگاتە ئاستی ئەو، من خۆم ژنێك ئەناسم بەدرێژایی بیست ساڵی ڕەبەقی هەوڵو تەقالا ئەوجا

توانی مێردەکەی لەکرێکاری لولە نەوتییەکانـەوە بگۆڕێتـە پیـاوێکی جوانپـۆش ..!خانم لەناستی ئەوەدا شەرمەزاری ئەوە بوو هەموو ڕۆژێك پیاوەکەیان ئـەبینی لەگەڵ خۆیدا توێشەبەرەی ئـەبردە سـەرکارو مێـردی هاوڕێکانیشـی لەخۆشـی و شادیدا ئەتلانەوە، خانم بۆ قایل کردنـی ئارەزووەکـانی دەسـبەکار بـوو، مێـردی بێچارە بۆ ڕازی کردنی دڵی ئەو دەسـتی لـەکار کێشـایەوە، لەکۆگایەکـدا بویـە ژمێریار، خوداوەند تەمەنی ئەم ژنە نەخشەکەی درێژ بکات بـۆ خـۆیی و کارێـك بەئەنجامی گەیاند ..! مێردەکەی گەیاندەوچ جاو جەلالەتێك...لەوەی مێردەکەی دوای بیست ساڵ ڕەنج دەسبەرداری هەمووی کردو قەڵەم و کاغەزی گرتە دەسـت ...! ئێستا ئەو پیاوێکە بەدبەخت,شەکەت و ماندوو ناڕازی هـیچ تـام و چـێژێك لەژیان و کارەکەی نابینێت بەڵام ژنەکـەی بـەو پـەڕی لەخۆڕابینینـەوە بەدەسـتە خوشکەکانی ئەڵێت : بەلێهاتویی خۆم توانیم مێردەکەم لەچینی کرێکاری ڕزگـار بکەم، دیارە بەلایەوە زۆر بوێرییە کەسـێك ناچـار بکـەیت دەسـبەرداری هـەوڵو ڕەنجی چەند ساڵە بێت، با ئەوەشمان لەیاد نەچێت زۆر جار بلـندی و پایـە بـەرزی نەگبەتی و بەدبەختی لەگەڵ خۆیدا دێنێت ...! ژنی زرنگیش ئەودیە وردبینی ئەم خاڵە بکات لەمێردەکەیدا، کاتێ ئەو لەپۆستی بچوکدا ئاسودەو کامەرانە، بەزۆر ناچاری پۆستی گەورەتری نەکات .

"شوارتزمن" دانیشـتوی "هونولولـو"نمونەیـەکی چـاکی ئـەم باسـەیە، ناوبراو لێپرسراوی گشت ماتۆڕسـوارەکانی بەڕێوەبـەرێتی پـۆلیس بـوو، بـەهۆی لێهاتویی و کارزانییەوە گوێزرایەوەبۆ پۆستێکی بەرزتر، دڵسۆزانە کارەکانی ئەنجام ئەدا، ئەولە کتوپڕێکدا زەردو لاواز بوو، شەوانە نەیئەتوانی ئاسایی بخـەوێت بـێ ئۆقرەیی و هەڵچون ئازارێکی زۆریـان ئـەدا، ناچـار سـەردانی پزیشـکێکی کـرد پزیشکەکە هاوڕێیەکی مێژینەی بـوو، دوای پشـکنینێکی سەرانسـەری هـەموو

گیانی بۆی دەرکەت هیچ کەمو کورییەکی جەستەیی تێدا بەدیناکرێت، پاشان کەوتە وتووێژ لەبارەی ئەرك و کارەکانیەوە دەسبەجێ پەیوەندی کردە بەرپرسی بەڕێوەبەرایەتییەکەوە وتی: ئیدی ئەو توانای بەڕێوەبردنی کارەکانی نەماوە، جەخت لێکردنی لەوانەیە بێتە هۆی تیاچونی پۆلیسێکی ماندوو نەناس، پاشان گەڕایەوە سەرپۆستەکەی جارانی و وردە وردە بەخۆیدا هاتەوە، بەچاکی ئەخەوت و ئەیخواردباری دەرونی و چالاکیەکانی گەڕانەوە باری ئاسایی.

"شورتزمن" ووتی: بۆم دەرکەوت حەزو خواستم کارەکەی پێشومی ئەخواست بەهای هەزار بەرامبەرزیاتری هەیە، بۆیە بەدڵ قایل بوون بەکارێك گرنگترو لەپۆستی گەورەترو دەرامەتی زیاتر .

لەیەکێك لەژمارەکانی رۆژنامەی "نیویۆرك تایمز"دا مانشیتێك سەرنجی راکێشام ...! نوسرابوو، خۆکوژی یەکێك لە ئەندامانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بەهۆی داواکارییەکەوە .... هەواڵەکە بەمشێوەیە بوو ..

پیاوێکی تەمن ٤١ ساڵ ئەندامی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا خۆی هەڵواسی و لەئەنجامدا خنکا ...! ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان ئەڵێن هۆکاری خۆکوشتنەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ داخوازییەك، کەسی ناوبراو زۆر حەزی لەپۆستی ئەندامێتی "دیپلومات " بووە بۆ ئەوەی کارو باری دەرەوەی وڵات لە ئەستۆ بگرێ هەربۆیە سێ جار داخوازی بەشداری تاقیکردنەوەکانی کردبوو هەرسێ جارەکە هەموو جارێك داواکەی پشت گوێ خرابوو بونە هۆی خۆکوژییەکەی، ئایا باشتر نیە لەبری خۆکوژی پێ لەبەرەی خۆمان زێتر درێژ نەکەین، مرۆڤ هەرگیز نابێت چاوەڕوانی ئەوە بێت سنورە سروشتیەکەی خۆی ببەزێنێت .

دکتۆر "پتراسین"لەکتێبی چۆن بەرپەرچی خۆکوژی بدەینەوە دا ئەڵێت : ئەو ژنانەی مێردەکانیا ئەخەنە ژێر فشاری پەیداکردنی پارەو پول و دەسەڵاتی

بالآ، بەڕاستی سەر لێشێواون، پاشان ئەڵێت : من خۆم بینیومە ژنانی بەرزەفڕ لەهیچ نازو نیعمەتێك ڕازی نین ئەبنە هۆی هەرەس هێنانی خۆشی و بەختەوەری و هەزارەها خێزان و ماڵ وێرانی ئەكەن، هەر بەم پێیەش پێویستە ژنان هاوكاری مێردەكانیان بكەن تا لەسنوری توانای خۆیاندا دەسبەكار بن، بیهودە هەوڵی ئەوە نەدەن ئەوان لەپێناوی خەیاڵ بلاوی خۆیاندا بكەنە قۆچی قوربانی.

"اندیرا موروا"لەكتێبی هونەری ژیاندا ئەڵێت :

نوسەرێك ناتوانێ داستانی هەمەجۆر بنوسێت، سیاسەتمەدارێك توانای چاكسازی هەموو لایەنەكانی نییە، جیهانگەردێك ناتوانێ تەواوی دنیا بگەڕێت و هەموو شوێنێك بەسەر بكاتەوە، بەم پێیەش كەسێك كەسێك توانای گونجاندنی لەگەڵ كاردا نییە ، بێگومان ئارەزو لەئەستۆ گرتنی ئەوكارە ئەبێت لەناخەوە ڕیشەكێشی بكات.گەر ئێوەش خوازیارن مێردەكانتان لەبەهرەی سروشتی زیاتر سودمەند بێت ، ئەوا لەناخەوە خۆشت بوێت ڕێزی كەسێتی بگرەو هانیبدە ژیانێكی ئاسودە بێنێتە كایەوە، هەرگیز مەیخە ژێر فشارەوە لەگۆڕینی كەسێتی ئەودا هەوڵی چالاكی مەدە..

## ٢١/ لەبەرەنگار بونەوەی مەترسی مەترسە

بەدەر لە کارزانی و لێهاتویی بۆ پلەکانی سەرکەوتن و غیرەت و بوێریش پێویستە، گەر سەنجێکی دەرو بەری خۆت بدەیت کۆمەڵێك دەبینی بابەتگەلێك دێننەکایە کەپێیان دەڵێن"قەزاو قەدەر "

نمونە:حەز نەکەن جگەرگۆشەکەتان لەبواری پزیشکیدا بخوێنێت تەواوی هەوڵەکانتان نەخەنەگەڕ تاپێداویستیەکانی بۆ مەیسەر بکەن، بەڵام وادردەچێت ئەو خوازیاری کاری هونەرییە یان حەز لەبواری وەرزشکاری ئەکات، ئێوەش پێتان وایە ئەو لەو بوارەیدا سەرکەوتوو نابێت، مێردەکەشتان هەمان بارودۆخی هەیە، لەوانەیە ئەو خۆی بداتە قەرەو بەرەی کارێك پێتان وابێت ئایندەیەکی رۆشنی نییە، بەڵام لێرەدا ئێوە وەك هاوسەرێکی وریا لەشێوەی بەدڵ بون و حەز لێکردنی کارێك کە ئەگەری رودانی مەترسی لێنەکرێت پێویستە هاندەری بیت نەك کۆسپی سەر رێی.

"چارلز روبرتسون"باوەگەورەم، لەکۆتایی سەدەی هەژدەیمدا ژیاوە، ئەو لەتاو ژیانی گوند نشینی دەورو بەری شاری "کانزاس" گەلێك بێزار دەبێت، دەیەویست بچێتە سنوری گوندەکانی هیندۆسە سورپێستەکان، لەکۆچکردنی بەرەو ئەوێی چی لێوەشایەوە، بەهەمان مەبەست خۆیی و ماڵو منداڵ کەلوپەلیان پێچایەوە بەرەو چارەنوسێکی نادیار وەرێکەوتن تا لەکەنارەکانی دەریای "سیمارون"کە ئەمرۆ بەباکوری رۆژهەڵاتی "اوکلاهاما"ناو دەبرێت لەوێدا نیشتە

جێبوون، باوە گەورەم كوخێكی لەتەختەدار دروست كردوو چەند دۆنمێك زەوی كشاوەرزی گرتە دەست و كەمە پارەیەكی قەرز كردوو پاشان دوكانێكی بچوكی لەو گوندە هەژار نشینەدا كە ئەمڕۆ پێی دەوترێت شاری "تولزا" دروستكرد."هریت"بەكەمدەستی و نەبونی و نۆ سەر خێزانەوە ڕۆژگارێكی سەخت و ناهەمواری بەسەر ئەبرد، دیوارەكانی ئەو ماڵە تەختە بەندەی بەپەڕەی كاغەز ڕوپۆش كردبوو ئەدەستی بەپزیشك و ئەبەئەخۆشخانەدا ئەگەیشت ، لەوێدا تەنها فێرگەیەكی یەك هۆدەیی بۆ سەرجەم منداڵانی ئاواییەكە هەبوو، تەنها چارەنوسی ئەوان لەژیاندا كارو ئەركی قورس و، قەرزو، زستانی سەهۆڵبەندان و هاوینی دۆزەخ بوو، بەڵام لەچاو ژیانی خەڵكی ناوچەكەدا گوزەرانیان زۆر خۆش و بەختەوەربوون.

لەگەڵ تەواوی ئەم سەختی و ناهەموارییەدا "هریت" لەژیانیدا سەركەوتوو بوو، بەچاوی ڕێزەوە تەماشای مێردەكەی ئەكرد، منداڵەكانی پێگەیشتن و زەماوەندیان كردو لەوەش گرنگتر لەڕوی هاوكاری و تەبایی خۆیی و مێردەكەیەوە بوونە دەوڵەمەندی ناوچەكە، بەرفراوانی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، تەنها قەرزاری تیژ بینی و شكۆداری پیاوانی وەك "چارلز روبرتسون"نییە بەڵكو ژنانی بوێرو چاپوكی وەك "هریت " لەخۆ بەدەستەوەدانی بەقەزاو قەدەر هیچ بیم و سڵەمینەوەیەكی ئەبوو لەبەرفراوانی ئەم وڵاتەدا بەشدار بوون، ئەم ژنانە جگە لەبڕوا بەخوداوەند، بونی لێهاتویی خۆیان و مێردەكانیشیان بەو پەڕی ئازایەتییەوە بەگژ مەرگ و ئەخۆشی و مەترسی و ئەداریدا چونەتەوە لەهەموو كات و شوێنێكدا پەناو پشتیوان و خەمخۆرو تین و تاوی دڵ و دەرونی مێردەكانیان بوون .

ئایا پێت وایە ئەوان لەکاتی کۆچی غوربەتیاندا بەحەسرەت و پەشیمانییەوە بۆ ماڵ و شوێن و جێگەی خۆیان بەداخ بوون ...؟

ئایا ئەدوری باوك و دایك و خزم و كەسوكارنازاریان نەچەشتووە ...؟

ئایا بیریان لەچەرمەسەری ئەو ژیانە نەکردبۆوە ...؟

خۆ ئەگەر هەستیان بەم ئەندێشانە نەکردبێت، هەرگیز ئادەمیزاد نەبوون، بەجۆرە ژیانی لێوەشاوەو دلێرو قارەمان رێگەی بیابانە ترسناکەکانیان لەگەڵ مێردەکانیاندا بڕیوە، ئەوەمان میراتێکی سەنگینیان بۆ وەچەکانیان بەجێ هێشتووە ...

ژنێك گەر بیەوێ بێتە هۆی سەرکەوتنی پیاوەکەی لەژیاندا ئەبێت هەمان هەستی ماندوو نەناسانەی ژنانی پێشڕەو بکاتە مەشخەڵ، ئەبێت بەخواست و ئارەزووەوە خۆ بداتە دەست خواستە ژیرییەکانی مێردەکەیی و بوار بدات ئەو کارەی ئەو خوازیارییەتی، گەر دوچاری مەترسیش بێت پێویستە داکۆکی و پشتیوانی لێبکات، کەسانێك داهێنان و نوێخوازی لەرێی ئارامی و ئاسودەیدا بەخت ئەکەن جۆرە کەسانێکن هەرگیز بەمەبەست ناگەن .

پیاوێك ئەناسم تەمەنی لەکارێکدا بەسەر ئەبات هەرگیز خۆشی لەو کارە نایەت، تەنها لەبەر ئەوەی ژنەکەی بەهیچ کلۆجێك قایل نەبووە ئاسودەیی و ئارامی خۆی بخاتە مەترسییەوە. ئەم پیاوە بیر کرد کردنەوەی سەرمایە لەکارگەیەکی چاکسازی ئوتۆمبێلدا سەرگەرمی کاری ژمێریاری بوو پاش ماوەیەك زەماوەندی کرد پاشان ژنەکەی پێشنیاری بۆکرد تنا خانوییەك نەکڕێت دەست لەکار نەکێشێتەوە .....

کاتێ کابرا خانوی کڕی بوبەخاوەنی منداڵ ئیدی ژنەکەی نەیهێشت دەست لەکار بکێشێتەوە، واز هێنانی مێردەکەی لەمکارە بەشێتی و دێوانەیی

ئەزانی ساڵانێك لەتەمەنی ئەو پیاوە وابەستەی ئەو کارە بوو، هەمیشە بەقەرزی خانوو پڕکردنەوەی بیمەو خەرجی خوێندنی مناڵەکان بەرۆکی کابرای ئەگرت و ئەیوت : ئەمە سەرلێشێواوی نیە ...؟ دەرامەتێکی حازرو کارێکی حازر لەدەست بدەیت بەدوای کارێکی ئەدیوی شاراوەدا وێڵ بیت...؟ گەرسەرکەتو نەبیت ئەوکاتە چی.. ؟بەمجۆرە پیاوی بیچارە بەخت یاوەری نەبوو ئەوکارەی ئەو خوازیاریەتی تاقی بکاتەوە، ژنەش ئامادەی ئەوە نەبوو خۆ بداتە دەست ئەو قەدەرە سەختەی چەند ڕۆژێك، ئەمڕۆش ئەو پیاوێکی بێزارو شەکەتەو ڕۆژانی پشوی بەچاککردنی ئوتۆمبێل بەڕێ ئەکات قیافەیەکی تێکشکاوو دەروننێکی ئاڵۆزی هەیە ژیان و خێرو خۆشی لەمێشك و دەرونی ئەودا نیەو تەمەنی بەفیڕۆ ئەچێوبەشە زۆرەکەی ژیانی لەپێناو کارێکدا خەرج ئەکات نابەدڵەو ئەمەش بەهۆی خانمی ژنی بۆی بویە ناستەنگ و ئەیهێشت ئەزمونەکەی لەکارێکی دیکەدا بخاتە گەڕ، چی ئەبوو گەر دەستی لەکارەکەی خۆی بکێشایەتەوە ئەزمونێکی شکستیشی هەبوایە ..! هیچ نەبێ خۆ بەگەیشتنی مەرامەکەی کەمێك ئاسودە ئەبوو کێش ئاڵێ سەرەنجام بەخت یاوەری ئەبوو، سەرکەوتنی لە ئامێز ئەئەگرت .

لەکۆمپانیای "براون نیك"دیانە لەگەڵ شەش هەزار ژنی خاوەن مێردی تەمەن جۆراو جۆر سازکرا،لەمیانەی دیانەکەدا پرسیاریان لێکردن : ئایا ئەو ئامادەییەت تێدایە کە پیاوەکەت دەست لەکارێك بکێشێتەوە ئەو کارەش مایەی بژێوی ماڵ و خێزان بێت.. هاوکات کارەکەی نابەدڵ بێت و دەسبەکاری پیشەیەکی تربێت بەمەرجێ هەقمایەکەی نیو بەرامبەر کاری پێشو بێت و حەزی لەمکارەیان بکات ...؟

تەنها ٢٥٪ وەڵامی نەخێر و٧٥٪ وەڵامی بەڵێ و ڕەزامەندی و حەزی پیاوەکانیان دا بەسەر دەرامەت و پارەکەیدا .

سەر دەمێك من بۆ پیاوێك بەناوی "چارلز وینولدز"بەرپرسی کارو باری دارایی کۆمپانیایەکی گەورەی سوتەمەنی لە"تولزا"دا کارم نەکردنەو لاوێکی بیرتیژو لێهاتوو نەجەوان بوو، زۆر بەچاکی بەپلەکانی ترۆقی و سەرکەوتندا وەژور نەکەوت، ژنێك و سێ منداڵ و ئایندەیەکی ئێکجار ئومێد بەخشی لەکۆمپانیادا هەبوو، ئەو لەکاتە بێکارییەکانیدا سەرگەرمی وێنەکێشان بوو زۆرێك لەتابلۆکانی بەدیوارەکانی ئیدارەدا هەڵواسیبوون، تاوای لێهات کڕیاران خوازیاری تابلۆکانی ئەو بوون.

ئەو بەهۆی ئەوەی ئارەزویەکی زۆری لەکاری وێنەکێشان هەبوو خەوی زێڕینی بەشاری "توزی"ی" نیو مکزیکو"وە ئەبینی ئەم خولیایە تیایدا هەراش بوودەستی پێ لەکار کێشایەوە، بڕیاریدا بۆ یەکجاری بچێتە شاری "توز" کاتێ لەگەڵ ژنەکەیدا کەوتنە ڕاوێژکردن، ژنەکەی وتی:کارێکی مەزنە، لێرە هەچیەکمان هەیە ئەیفرۆشین و ئەچینە ئەوێ، دڵنیام لەمکارەدا سەرکەوتن دەبێتە چارەنوسمان...!

ئەم هاندان و سورکردنە هێندەی تر کابرای دڵگەرم کرد، تەواوی ماڵ و ژیانی وەلاناو بەکەرەسەو فڵچەی وێنگەرییەوە بەرەو شاری "توز" کەوتنە ڕێ، گیانی هاوکاریو گونجاندن لەهەمو ئەندامانی خێزانەکەدا ڕەنگی دابویەوە، ئەمڕۆنەو بەیەکێ لەهونەرمەندە گەورە بەناو بانگەکانی خۆرئاوای ئەمریکا هەژمار دەکرێ تابلۆکانی لە سەرانسەری گەلەرییە هونەرییەکانی ئەمریکادا نمایش دەکرێ کە هەندێکیان تایبەتن بەنمایش کردنی شاکارەکانی ئەو، هەمو

ئەم سەركەوتنانە بەهۆی بوێری و خۆدانەدەست قەدەر هاتنە كایەوە، زۆرن ئەوانی خۆنەدەنە دەستی و لەئەنجامیشدا سەركەوتو ئەبن .

ژەنـــراڵ"وانـــدرگریف"ســـەركردەی هێزەدەراییـــەكانی بـــەرەی جـــەنگ بەهاورێكانی ووت: خوداوەند یارو یاوەری كەسانی بوێرو سینە فراوانە

كارێكیش كەلەدەرونەوە لەگەڵ پیاودا بگونجێـت ئەوەیـە بەتامەزرۆییـەوە تێیـدا رۆنەچێت – پێویست ناكات بیكاتە سەرمایەدارو بێنیازی بكات چونكە پیاو لـە ژیاندا خۆی سەركەوتنی خۆی نازانێ مەگەر لەكارێكدا مایەی رەزامەندی دەرونی بێت، هەڵبەت ئەبێت ژن لێـرەدا ئـەو ئەركـە لەئەسـتۆ بگرێـت یـا ئـەو بـوارە لەكارێكدابرەخسێنێ كە مێردەكەی هەرچەندە دەرامەتی زیاتری لێدەسگیر بێـت، بەڵام هاوكات مایەی نابەدڵی بێت پێویستە هانی چاوپۆشی لێكردنی بدات پاشان رێخۆشكەربێت بۆ ئەوكارەی مایە سەلیقەو حەزیەتی هەرچـەند دەرامەتەكەیشـی كەمتر بێت .

زۆرێك لەپیـاوان سەركەتن و سەرفەرازی و بەختەوەری خۆیان بەقـەرزاری ژنانی فیداكارو وەفادار ئەزانن كەبەگیانی لەخۆبوردەییەوە سـەرمایەو ئومێـدیان ئەدەنێ تا بەدڵ و گیان ئەو كارەی مەبەستێتی ئەنجامی بدات .

دەزگای خێرخوازی"قشون نجات"دامەزراوەیەكی زیندووە دەسكەوتەكانی بەتەنیا قەرزاری "ولـیم بـوت"ـێن فیـداكاری و لێبـوردەیی و هـەوڵی بێوێنـەی "كاترین بوت"ە پشتیوانی لەو ئەخشەیە ئەكردو بویە هۆی پایـەدار بـوونی ئـەو دەزگایە،"ولیم بوت"هەستی كرد خوداوەندتوانایەكی بێوێنەی پـێ بەخشـیوە بـۆ خەڵكە ئەدارو هەژاری گەرەكە چرەكانی لەندەن و ئامۆژگاری ئەكردن، ئەو ماڵ و خێزانەكەی خۆی لە سـەرماو برسـێتیدا نازاریـان ئەچەشـت بـەڵام دەسـبەرداری كارەكەی خۆیان ئەدەبوون، ئەولـەپێناو كۆمـەكی بێنەوایانـدا سـەلامەتی خـۆی

لەدەستدا،"کاترین" لەمنالّیەوە توشی نەخۆشی چەمینەوەی بربڕەکانی پشت ببو وێڕای ئەمەش نەخۆشی سیل ناوێزانی بوتا گەیانیە شێرپەنجە، ئەو لەسەرەمەرگدا نەوەی ئاشکرا کرد بۆتەنها ڕۆژێك نەبوو نەمژنە بێدەردو ئازار تیکەیەك نان لەگەروی بچێتە خوار ...! ئەو سەرباری ئەمانە نەك تەنها پاك و خاوێنی و ئەرکی ماڵ بەڵکەچاودێری هەشت منداڵیشی ئەکردو هاوکاری مێردەکەیشی ئەکرد لەکۆمەك کردنی کەسانی هەژارتر لەخۆیان، ئەو لەنامۆژگارییە مەزهەبیەکانیدا دەسبەکاربوو شەوانە بەگەڕەکە چڕەکانی لەندەندا ئەگەڕاوسەردانی خەڵکی برسی و بێدەرەتانی ئەکردوخەڵوەتگەی پیرو پەککەتوو بێوەژنانی دروست ئەکرد، لەگەڵ دزو جەردەو ڕێگرەکاندا ئەدواو ڕێنمایی ئەکردن بۆپەیداکردنی کاری گونجاو وە دەست هێنانی بژێوی، لەوانەیە پێتان وابێت ئەو چاوڕوانی پێگەیەکی گونجاوی کردبێت تالەم چەرمە سەرییە ڕزگاری بێت، ئەم هەلەیش بۆ ئەو ڕەخسا، هەرکە قەشەو ڕاهیبەکان لێبڕاوی ئەویان بینی، پێشنیارێکیان بۆکرد بۆ سەرۆکاری حەوزەیەکی مەزهەبی لەکلیسادا بەمەرجێ دەسبەرداری کارەکەی بێت، ئەم دەستەیە مەیل ونارەزووەکانی خانم"بوت" ئەمەش لەنارەزووەکانی خانم "بوت" نەبوون، بۆیە ئەم فیداکارە لەجێگەی دەرپەڕیو وتی هەرگیز ...هەرگیز...!لەسای گورو تینی ئەمەوە ڕێکخراوی خێرخوازی "سالویشن"هێشتا بەردەوامەولەچالاکیدایە، خۆزگە زیندوو بمایەو بیدیبایە کە فیداکاریو پشتیوانی لەنیاز پاکی مێردەکەی چۆن دەرەنجامێکی بەرزی وەدیهێنا، بریا بیزانیبا لەمەراسیمی بەخاك سپاردنی مێردەکەیدا زیاد لەشەش هەزار کەس بەشداری هەڵگتنی تەرمەکەیان ئەکرد ..! سەرۆکی شارەوانی لەندەن لەسەر مەزاری ئەو ئامادەبوو، شای وڵاتان و سەرەك کۆماری ئەمریکا دەستە دەستە تاجە گوڵینەی شکۆمەندی و ڕێزلێنانیان بەدەستەوەبو، لەدوای کەژاوەی

تەرمەکەیەوە ٥٠٠٠هەزار لاوی خوێنگەرم سەربە رێکخراوی "سالویشن"سرودی ماتەمینیان بۆ ئەووت، خۆزگەم ئەخواست ئەم ژنە لاوازو نەخۆشەکە ئاسودەیی و ئارامشی خۆی پێشکەشی مێردەکەی کرد پەروانە ئاسا بیزانیبا هاوکارییەکانی چ شاکارێکی مەزنی لەدوای خۆی بەجێهێشت و ئەو رێکخراوە چۆن شۆرەتێکی دەرکرد.

بەڵێ... سەرکەوتن... واتە : کارێك پەیدا بکەین لەناخەوەبۆی بسوتێین، پشت هەڵکردن لەناسودەیی و ئارامی هەندێ دەبێتە هۆی ئەوەی بمانگەیەنێتە ترۆپکی مەرام و مەبەست.

"روبرت لویس استیونسن " ئەڵێت :

پیاوێکم ئەوێت هێندە تیژ بین و هۆشمەند بێت کاری شێتانەی لێبوەشێتەوە

"شکسپیر" ئەومەبەستەی سەرەوە بەمجۆرە ئەخەملێنێت:

گومان و ترس و خەمۆکی گەورەترین خیانەتکارمانن ئەو خاینانەی دەبنە ئاستەنگی ئەو کارانەی خێرو بەختەوەرییان تێدا بەدی ئەکرێت، خواوەند یارو یاوەری چاونەترس و بوێرانە.

## ٢٢ ژنی میهرەبان

وارسکاوە هەمیشە ژنان ویردی سەر زمانیان مێردەو بەلگەی نارەزایی و کەمتەر خەمیەکانیان نەکەنە بیانو، هەرگیز لەخۆشیان ناپرسن مێردەکانیان چ مەبەستێکیان هەیە،ئایا گەرڕستەیەکی ئارمی بەخش بەکەسێك بلێیت لەوەلامدا بەقسەیەکی نەشیاوو ڕەق وەلامت نەداتەوە ...؟

گەر ژن بایەخ بداتە خواستەکانی پیاو شادمانی خۆی لەشادمانی ئەو جودا نەکاتەوە،بێگومان ئەویش بەرەو شادمانی بالاتر هەنگاوەکانی هەلئەگرێت بایەخێکی زیاتریش بەو ئەدات.

"ا.ی.ج. هاردی "نوسەری ناودار ئەلێت :

لەیەکێك لەگۆڕستانەکانی"زلاندو" کۆنە گۆڕێك هەیە لەسەر مەزارێکی نوسراوە ..ئەو ژنێکی گەلێك ڕاز بەخش و خۆشەویست بوو.. نازانم ئەم ڕستەیە تاچ ئەندازەیەك کاریگەری لەسەرتان هەیە...؟ بەڕای من جوانترین ووتەیە ...! ئەو پیاوە خەمخۆرەی ئەمەی نوسیوە دیارە هەزاران یادەوەری شادی بەخشی ئەوی لابووە، هەمیشە بەڕوی خۆش و خەندانەوە پێشوازی لێکردووە خوانی ڕازاوەی لەبەردەمیدا ڕاخستووە، لەهەموو خۆشی و ناخۆشی و تالی و سوێریدا هاوڕێ و هاو خەم بووە چوارچێوەی مالی بۆ کردۆتە بەهەشتێك و ئەئامێزی گرتووە.

ژنێکی گونجاوو میهرەبان کاریگەری تەواوو حەتمی لەسەرکەوتنیپیاوەکەیدا هەیە بەوتەی گەورە پیاوان کارو باری ئەو پیاوانەی ژنی میهرەبانیان هەیە لەکۆمەلێشدا سەرکەوتن یاوەریانە، بەتەواوی سەرسامییەوە زۆریك لەژنان لەناخی دلیانەوە مێردەکانیان خۆش ئەوێت تا ئاستی پەرستن ، بەلام نازانن چۆن

ئاكارو ڕەفتاریان بكەنە جێی ڕەزامەنـدی و پـێ پەسـەند بـوونی مێردەكانیـان ؛ ئەمجۆرەش بەتەواوی نیاز پاكییەوە بەدترین ئاكاری ناپەسـەندیان لێنەوەشـێتەوە، نمونە: كاتێك مێردەكەی بۆكارێك خۆ ئامادە ئەكات ئەیـەوێ بەڕێبكـەوێ ، ئـەو بەوێنەی زەروو پیایدا ئەنوسێت ، یان كاتێ پێویستە ئەوگوێ بگرێت كوت و مت توتی ئاسالەسەربای بەڕەی خۆیەتی و هەرئەڵێت و ئەڵێتەوە..!

یان وەك فەرماندەیەكی سەربازی ئاسـا لەماڵـدا فەرمانـدەرن، ئەمـەش لەحاڵێكدا گونجاندنی ئاكارو خوی پەسەند بۆ مێرد هێندە كارێكی گرینگ نیـە، هەربەئەندازەی میوانداریيەك یا كەمتری سـەلیقە پێویسـتە، تەنانـەت هێنـدەی خۆگۆڕین و نارایشت كردنێك ناخایەنێت، لێرەدا مەبەستم لەوەیـە، ئێمـەی ژنـان نابێت هەر دڵمان بەلای جل و پۆشـاكو ڕوخسـارمانەوە بێـت، چـونكە ئەمـەیان كارێكی ئاسایی و هێمای هونـەری ڕەگـەزەو هـەمو ژنێـك لەتوانایدایـە، بـەڵام مەخابن هێندەی بایەخ بەجوانكاری و ڕازاندنەوە دەرەكییەكان ئەدەین نیو هێنـدە بایەخ بەنێوەرۆك نادەین، هـەربۆ نارایشـت و ڕازاندنـەوەی ڕوكەشـەو خۆراكێـك بۆدەروغان نانێرین.

هاوسـەرداری سـەركەتوو بەشـێوەیەكی گشـتگرپابەندە بەهۆشمەنـدی و زرنگی بیروهۆشی ژنانێك كـەبزانن بـەچ ڕێگەیـەك مایـەی پـێ پەسـەند بـوونی مێردن.

لەدیمانەیەكدا لەگەڵ"الینور رۆزڤیلـت" ووتـی: مێردەكـەمم زۆر خـۆش ئەوێت لەگەشت و گوزارو پشوەكانی هاوینیشدا تەنها منـداڵێكم لەگـەڵ خۆمـدا ئەبـەم تـا بتوانـێ مانـدوێتی بەتەسـەلی بحەوێنێتـەوە لـە شـوێنە بێـدەنگ و ئارامەكاندا.

بەبڕوای "ئایزنهاور"یەکێك لەئەرکە حەتمییەکانی ژن ئەوەیە بەشۆخی و
١١ەرانی و بەسەرهاتی پێکەنین ئامێز ئاسودەیی مێردەکەی دەستەبەر بکات.

ڕەفتارو ئاکاری چاك بریتیە لەفیداکاری.

"لرد چستر فیلد"فەیلەسوفی ناودار ئەلێت :ژنانێك بیانەوێ لەژیانی
هاوسەرداریدا بەختەوەرو مایەی پێ پەسەندی بن پێویستە گیانی فیداکارییان
تێدا بێت کەواتە ئەوڕەفتارانەی ئەو پێی ناپەسەندە پێویستە چاوپۆشییان
لیبکات .

خاتو " الگا کاپا بلانکا"دانیشتوی شاری نیویۆرك هاوسەری کۆچکردوو"
جوزیف کاپا بلانکا "ی سیاسەتمەداری "کوبا"یەو لەشەترەنجدا پاڵەوانی
نیودەولەتی بوو، "کاپابلانکا"خاوەنی کەسێتیەکی ناودارو بەرجەستە
بوو،بەرێکەوتنی رۆژگار هاوسەرداری ئەم ژن و مێردە بەسەرکەتویی و عەشق و
شەیداییەکی دولایەنە هاتە مەیدان " الگا" بەئەندازەیەك هۆکارەکانی پەسەندی
بۆنەرەخساند هەمیشە لەئاست پێویستییەکانیدا سەری خۆ بەدەستەوەدانی ئەوی
ئەکرد، ئەو حەزی بەوە بوو هەمیشە بەشداری بۆنەو ئاهەنگەکان بکات ،
هەرکاتێکیش مێردەکەی ئەو حەزەی ڕەت بکردایەتەوە زۆر ئاسایی بوو بەلایەوە،
چاوپۆشی لەو حەزەی خۆی ئەکرد نەینەکردە ئاژاوەو بۆڵە بۆڵ، گەر ئەو
پۆشاکێکی بەدڵ نەبوایە دەسەجێ ئەیگۆڕی بۆخواستەکەی ئەو، تۆ بڵێی
"کاپلانکا"لەبەرامبەر ئەم فیداکارییەدا بەئەمەك بوبێ، ئەوپێی وابوو خەلات و
دیاری کارێکی منداڵانەیە، کەچی وارێکەوت لەبۆنەی " والنتاین"دا پاکەتێك
شیرینی کەبەهەزارپەت پێچرابویەوە کردیە خەڵاتی ژنەکەی، ئەم خەڵاتە
ناشایستەیەش نەك ئەو هەمووژنێکی بێزار ئەکرد، کەچی ئەو لەئاست ئەم
خەڵاتە کەمبایەخەدا کەلەلایەن پیاو ماقولێکەوە کرابویە خەڵاتی هێندە خۆی

بەخۆشحاڵ نواند ئیدی دوای ئەوە یەكێ لەچێژە گەورەكانی پێشكەش كردنی خەڵات بوو بۆ ژنەكەی، تەنانەت جارێكیان دوكاتژمێری تەواو خەریكی شاردنەوەی شوشویەك بۆنی بچوك بوو لەبیست پارچە كاغەزی جۆراو جۆری پێچا ئەوجا كردیە دیاری بۆژنەكەی.

كەواتە هەرژنێك بەمشێوەیە ڕەفتار بكات شادی و كامەرانیەكانیان بۆدەبێتە دوبەرامبەر .

هاوسەردكەی " دیزرائیلی"سیاسەتمەداری بەریتانی هەمیشە ئەیوت: لەسایەی خۆشەویستی مێرددكەمەوە سەرلەبەری ژیانی منیش پڕخۆشی و كامەرانیە .

## ٢٢ هاوڕێی و شادمانی و سەرگەرمی پیاو

ڕونکردنەوەی وەرگێڕی ئەم کتێبە بۆزمانی فارسی ئەڵێت:

کاتێ سەرگەرمی وەرگێڕانی ئەم بابەتە بووم خودی خۆم شاهیدی ڕووداوێکی سەرنجڕاکێش بووم کەگێڕانەوەی هاوتەریبە لەگەڵ مەبەستەکەی هاتو"دوروتی کارنگی"داو خاڵێکی بەپێز ئەخاتە ڕوو .

یاریەکانی جامی جیهانی تۆپی پێ دەستی پێکردو ورووژاندێکی گەرمو گوڕی هێنا گۆڕێ و وڵاتی ئێمەش بەشداری ئەم خولانەی کرد، ئەو شەوەی یاری نێوان تیمەکانی بولگاریاو –سوئید بۆیاڵاوتنی خولی سێیەم دەستی پێکرد لەماڵی یەکێ لە هاوڕێکانم میوان بووم پەخشی ڕادیۆیی سەرلە بەیانی ڕۆژی یەکشەممە٢٦ تیرماه ١٣٧٣ – ١٩٩٤ دەستی پێکرد ، ئەو ژنەی مێردەکەی بەتامەزرۆییەوە چاوەڕوانی دەسپێکردنی یارییەکە بوو ووتی: کەسێکی چەند خۆ پەرستی، ئەتەوێ لەبەرخاتری خۆت خەومان لێ بزڕێنی، دیار بوو کابرا ئەم قسەیەی زۆر لەبەر دڵ گران بوو بەشێوەیەك کەمەبەستی ڕەچاوکردنی هەڵوێستێك بوو گوایە میوانمان هەیە ووتی:

خانم: ئێ خۆ لەسەرانسەری جیهاندا زیاتر لە دوو ملیارد کەس تەماشای ئەم یارییە ئەکات، پاشان خۆمن ئەو کاتە ناسکەم دیاری نەکردووە تا یارییەکەی تێدا ئەنجام بدرێ، خانمیش بەم وەڵامە گەلێك قەڵس بوو هەربۆ خۆ نواندن بەشێوەیەی فەرماندە ووتی:

- من نازانم گەربێت و ئەو تەلەفزیۆنە ڕۆشن بکەیت وای بەحاڵت چی بەچاوی خۆت ئەبینی ...!

پیاوەکە بەزەردە خەنەیەك زۆر لە ژەهر تاڵتر بوو ووتی:

- خانم دەنگی تەلە فزیۆنەکە تەواو کز ئەکەم تەنها تەماشای وێنەکەی ئەکەم.

خانم هیچ جۆرە قایل بونێکی پێوە دیار نەبوو ئەمجارەیان زۆربەتوندی و توڕەییەوە ووتی:

- کاتێ ووتم تەماشاکردنی یاری تۆپی پێ نییە واتە ئەبێت تەلەفزیۆنەکەش کوژاوە بێت .

پیاوەکەی بەو پەڕی توڕە بوونەوە ووتی:

- جا تۆ حەز لەیاری ناکەیت ، تاوانی من چییە ...؟

پاشان ژنە هەرگوێی لەم ڕستەیە بوو ووتی:

- مەسەلەکە حەز نییە، من ئەبێ زو بخەوم بەیانی ئەچم بۆسەرکار،گەر وانەکەم توشی ژانە سەر ئەبم، بەلای جەنابتەوە سەلامەتی من گرنگترە یا تەماشاکردنی یاری ..؟ کابرا دەمی بو بەتەڵەی تەقیوو..!

ئیدی من و مێردەکەم کەدیتمان ئەم دوانە هیچ کامیان ئامادەی میوانداری و شەو نشینی نین ,, منیش دەنگی کاتەکەم کردە بیانوو هەستاین و بەرەو ماڵ کەوتینە ڕێ ، بۆبەیانی ژنەی هاوڕێمم بینیەوە ووتی: دوا بەدوای ڕۆشتنی ئێوە مێردەکەم جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە هەرئەبێ ئەو یارییە ببینێ ووتی هەرهەڵەیەك ئەکەیت بیکە، ئەتوانی بچیتە ژوری نوستن و دەرگاش لەخۆت دابخەیت تێرو پڕ بخەویت ..! هاوڕێکەم بەدەم گریانەوە چوبۆ

سەرجێگەی نوستن ئێستا بەدەم ژانە سەرەوە ئەتلێتەوە، هێشتا ئەو دەرفەتەم نەبوو تا بەخانم بڵێم :

تاوانبار تەنهاخودی خۆتە ... کەچی بەردەو تەلەفۆنەکە رۆشت و پەیوەندیەکی لەگەڵدا گرت ووتی:جەناب لەبەر خاتری تۆ من ئێستا بەدەم ژانی سەرمەوە ئەتلێمەوە، بەتوندی گوێم لەدەنگی مێردەکەی بوو ئەیووت:

- ببورە خانم کارم هەیە، گەر زۆر نەخۆشی ئەتوانیت بچیت بۆلای پزیشك، هاورێکەم بەتورەییەوە قیژاندی ووتی:

- تۆ بەلای خۆتەوە کەسێکی تێگەشتویت ئەمە حاڵی تۆ بێت قوڕ بەسەر کەسانی ئاسایی، کابرا بێدەنگ بوو گوێ لەقسەکانی گرت ، ژنەکە ئەمجارە هەستی زاڵبوونی کردەوە دوبارە پەیوەندی کردەوە، بەلآم مۆڵەتم نەدایێ ووتم:

- گەر لەبەرت گران نەبێت بەراستی ئەمجارە تۆ تاوانباری گەرکەمێك بایەخ بەسەرگەمیەکانی ئەو بنوێنی تۆیش لەیارکەی دوێنێ شەو چێژێکت ئەدی، ئێمە کە گەراینەوە بۆ ماڵی خۆمان بەساردییەکەوە تەماشای یارییەکەمان کرد، تۆ بیرت لەوە نەکردەوە ئێمەش لەوانەیە حەز بەبینینی ئەو یاریە بکەین ..؟کاتێ رەفتارت لەگەڵ ئێمەی میواندا بەو شێوەیە بوو ئەبێ لەگەڵ ماڵ و منداڵدا چۆن بیت...؟

ئەو رۆژە ماوەیەك لەگەڵ ئەو خانمدا کەئەنەچوە ژێرباری تاوانباری خۆی دەربارەی هونەری هاوسەرداری وتووێژمانکرد، بەلآم دڵنیام لەوەی گەشتینە ئەنجامێك سەرنجێکی لەقسەکانم دابێت ، چونکە بەدرێژایی ساڵانی هاوسەرداری سەرنجم ئەدا ئەو مەبەستی فەرەماندەیی بو بەسەر مێردەکەیدا بەبێ بچوکترین حەزی مێردەکەی لەو جۆرە ژیانە، رێژەی ئەمجۆرە ژن و مێردانە کەم نین و مەخابن

هەرلایەك بۆخۆی سەری گوریسەکە ڕاتەکێشێت و خۆی بەهەق ئەزانێ و ئەوی دیکە بەتاوانبار، ڕاستیش لەوەدایە بڵێم خەتای پیاو کەمترە و ژن زیاتر، ئەوەش نەزانم گەر هاوڕێکەم هەوڵی چاکسازی ناکاری خۆی نەدا ئەوا بەداخەوە ماوەیەکی زۆر پێکەوە هەڵناکەن پەتی پەیوەندیشیان لەبچڕاندایە، چونکە لەزۆرێك لەژن و مێردانم بیستوە کە هێندە لەیەکتری بێزارن تەنها لەبەر خاتری منداڵ ئەو ژیانەیان گرێداوەتەوە وەگەرنا لەمێژە پەتی پەیوەندیان بچڕاوە.



یەکێك لەوڕێگە گرنگانەی خەڵکی لێك نزیك ئەخاتەوە تێکەڵاو بوونە، بنەمای خۆشبەختی وپەیوەندی مرۆڤایەتی و خۆشەویستی ئەوەیە لەسەرگەرمی و خواستو ئارەزوەکانی هاوڕێیانە، ئەم بۆچونەش ئەزمونی لێکۆڵەر "تی.جی.ودهوس"ی دەروونناسی بەناوبانگە کە دەربارەی ٢٥٠ژن و مێردی بەختەوەرو لێك ڕازی تاقی کردۆتە، کەواتە هاوڕێیەتی و لێك گەیشتن بەڵگەی سەرکەتویی و ڕەزامەندی هەردوکیانە لەهاوسەرداریدا، خۆشەویستی هاوبەش شادمانی، ئەندێشەو بیروڕای هاوبەش بنەمای هاوڕێیەتین، ئەمانە ئەوجۆرە ئەست و سۆزداریانەن خەڵکی پێکەوە ئەبەستن.

نمونەش:"ارتورموری و کاترین" دوانە هاوسەری کامەران و ناسراوون تاکو ئێستا هیچ مامۆستایەك هێندەی ئەوان قوتابی وفێرکەر نەبووە ٢٨ساڵ ئەم دوانە هاوسەرداریان کردووە، کاتێك لەخاتو"کاترین"م پرسی : ئایا تۆو مێردەکەت هێند لەنزیکەوە کاردەکەن هیچ کاتێ گلەیی و گازندەیەکتان لە یەکتری نییە...؟ ئایا پێتان گران نییە...؟ ئیرەیی بەیەکتر نابەن، واتە ئەو بەژنان تۆ بەپیاوان وانەکانتان ئەڵێنەوە ...؟

لەوەڵامداووتی: نەخێر ... من ڕەچاوی گەلێك شت نەكەم ،سەبارەت
..... ئەیشم پێویستە لەڕادەبەدەر خاوێن و جوانپۆش بم، چونكە ڕۆژانە لانی كەم
..... ی دەكەس زیاتر نەیمەوە، ڕەفتارم لەتەكیاندا وایە، مێردەكەم تەواو بڕوای
پ..مە نەزانێت دركێك ناچێت بەپێمدا ...! چونكە هیچ جۆرە سنور بەزاندن و
..اسەتەندیم لەگەڵیاندا نییەن، دیارە ڕازی سەركەتویی لەپەیوەندی هاوسەریماندا
..ەرگەرمیە هاوبەشەكانمانە، هەردوكمان خولیای مەلەكردن و یاری "تێنس"ین
لەهەر هەلێكی بچوكدا بۆمان بڕەخسێت دەسبەكارین، هەروەك هەفتەی ڕابردوو
كەمێك بێكاربووین دەسبەجێ خۆمان گەیاندە "برمودا"و سەرگەرمی مەلەكردن
بووین.

ئەو وتی: تەواوی كاتی كاركردن و نەبونی هیچ جۆرە یاری و بابەتی سەرگەرمكردن ژیانی هاوسەرداری سست و تەوەزەل نەكات، كەسێك گەربیەوێ بێتە مایەی پێپەسەندی مێردەكەی با هەوڵی ئەوە بدات فێری ئەو سەرگەرمیانە بێت كە مێردەكەی خوازیاریەتی تالە بێكاریدا كاتی پێبەسەربەرن

"هاری استین" پسپۆڕی بواری هاوسەرداری ئەڵێت :ساكاری وبیروڕای یەكدی لەبەختەوەری هاوسەرداریدا كاریگەرترو گرنگترە لەوەی ژن و مێرد بیروڕایەكی هاوبەشیان هەبێت .

"كلیوپاترا"ی شاژنی میسر زۆر چاك ئەیزانی ببێتە مایەی پێپەسەندی و خۆشەویستی لای خەڵكی تەنانەت لەخۆشەویستی پیاواندا بلیمەتییەكی بێوێنەی هەبوو، ئەویش هەرشتێ بەلای پیاوەوە مایەی سەرگەرم بوون بوایە بەشداری تێدا ئەكرد، ئەو زمان و لەهجەی هەموو بازرگانەكانی ئەزانی كارێكی بێ پێشینەو هیچ یەكێك لەباووباپیرانی نەیانكردبوو، كاتێ نوێنەری وولاتە یەكگرتووەكان سەردانیانكرد"كلیوپاترا" بێئەوەی پێویستی بەوەرگێڕێك هەبێت بەزمانەكەی

دایکی ئەوان وتوویژی لەگەڵ ئەکردن بەو هۆیەشەوە بویە مایەی خۆشەویستیەکی تایبەت لەدڵی ئەواندا.

"مارك انتونی" سەرداری گەورەی رۆم، زۆر حەزی لەڕاوە ماسی بوو...! "کلیو پاترا" شەیدای جوانی و عەیش و نۆش بوو، کەژاوەی تایبەتی تەیار ئەکردو پێکەوە ئەچونە ڕاوەماسی، جارێك "انتونی"دوای تێپەڕبونی چەندکاتژمێرێك هێشتا ماسیەك نەبوبو بەقولاپەکەیەوە "کلیوپاترا"بەنهێنی فەرمانی دەرکرد بەیەکێ لەغولامەکانی بەژێر ئاوەکەدا بڕوات و ماسیەکی گەورەی زێڕین بکات بەقولاپەکەیەوە بۆ"انتونی" کلیوپاترا لەبەر خۆشحاڵی "انتونی"هەندێ کات جۆرە پۆشاکێکی ئەپۆشی و دوقۆڵی بەگەڕەکە چڕو هەژارەکانی ئەسکەندەریەدا ئەگەڕان و فەرشی شاهانەیان تێدا ڕائەخست، مەبەستی ئەو ئەوە بوو هۆکارەکانی سەرگەرمی بۆ "انتونی" بسازێنێ تاکو ببێتە هاورێ و کەسێکی دڵپەسەند.

ئایا چەند کەس لەئێمە ئامادەیە لەبەر ئەوەی ببینە هاورێ و دۆستێکی دڵپەسەندی مێردەکەمان، پانتۆڵ و پۆتین بپۆشین و قولاپی ماسی هەڵگرین و بەناو قوڕو چلپاودا ڕێبکەین بۆڕاوە ماسی ..؟

من ژن گەلێکی ناڕەزا ئەناسم هەمیشە گلەیی و گازندەیانە لەدەست مێردەکانیان لەڕۆژانی پشودا تەنیایان ئەکەن خۆیان ئەچنە سەردان و گەشت و گوزار.

کۆچکردوو"لئون اسکون میکر"ئەندازیارێکی دەسبەکاری گەورەی ڕێگاو بانەکانی شاری نیویۆرك بوو هاوشان ئەندامی کارای چەندین یانەی شمشێر بازی ئولۆمپیك و پاڵەوانی یاری"گولف"بوو، کاتێك هاوسەرداری بەست، ژنەکەی کەمترین زانیاری لەسەر یاری "گولف"نەبوو، بەڵام نەك هەرتەنها بویە

ڕ...سکی لێزان لەو یاریەدا بەڵکە لەیاری شمشێربازیشدا بەپاڵـەوانی نێونەتـەوەی ناوبان ناوی دەرکردو چەندین خەڵاتی گەورەیشی بەدەست هێنا، گەر ئەو لەهـەوڵی سەربونی سەرگەرمیەکانی مێدەکەیدا نەبایە نەك تەنها شانازییەك یاوەری نەئەبوو بەلکو لەژیانێکی تاڵ و ناهەمواردا ئەتلایەوە.

"ادگـار والاس"لەنوسـینی داسـتانی پۆلیسـی و تاوانکارییەکانـدا دەستێکی باڵای هەبوو، ئەوەی مایەی خواستی بوو مەیدانی ئەسپ سواری بـو، کەچی هاوسەرەکەی بەهیچ جۆرێ لەگەڵ ئەو خواسـتەدا نەئـەگونجاو زانیاریـەکی ئەوتۆشی لەبارەیەوە نەبوو، هەربۆیە چویە مەیدان و هانـدەری مێردەکەشـی بـوو لەو بوارەدا، هەمیشە دەستەو دوعا بوو مێردەکەی لە پێشبڕکێکاندا سـەرکەوتن بەدەست بێنێ، ژنانێـك لەحـەزو سـەرگرمی مێردەکانیـان خۆشـحاڵی دەرئـەبڕن مانـدوێتی فێربـوون ئەچـێژن، کـەم ڕێ ئەکـەوێت مێردەکانیـان بەتـەنیایی کەمترخـەمیان بسـپێرن...! ئایـا ئێـوەش مێردەکانتـان خـاوەنی حـەزو سەرگەرمییەکەو تەنیا بەجێتان ئەهێڵن ...؟ گەر وایە لەوانەیـە مێردێکـی خـۆ پەرست کەمتەرخەم بێت .. یان ئێوە وەڵامی حەزو ئارەزوەکانی نادەنەوە .

"فرانسیس شۆرت" لەمانگەکانی سەرەتای هاوسـەریدا زۆر پەرێشـان و خەمۆك دەرئەکەوت، مێردەکەی بەخوی سەردەمی بێژنیەوە ئالودە بوبـو زۆربـەی شەوان و ڕۆژەکانی پشوی لەدەرەوەی ماڵ لەگەڵ هاورێکانیدا بەسەر ئـەبرد، ئـەو بەوەی زۆری حەز ئەکرد ڕۆژێك مێردەکەی بکەوێتە مـاڵ هـەرگیز بۆڵـەو پرتـەو گریانی نەئەکرد، ئەوی بەکەسێکی کەمتەرخەم نەئەدایە قەڵەم و نەئەچویە مـاڵی باوکی و سکاڵایەکی دەرنەئەبڕی، لـەبری ئەمانـە هـات بەخەیاڵیـدا مێردەکـەی خواست و ئارەزوی چییە تا لەماڵدا بـۆی دابـین بکـات، مێردەکـەی زۆر حـەزی لەیاری "چکرز" بوو گـەلێك لێـزانیش بـوو، هەربۆیـە هانیـدا و پێـی ووت کـە

ئەمیش فێری ئەوپارییە بکات ، پاش ماوەیەك بویە یاریزانێکی چاك لەگەڵ مێردەکەیدا، ئیدیٌ مێردەکەی هاتە سەر ئەوبڕوایەی هاورێکانیشی بانگهێشتی ماڵەوە بکات، خانم لەهەوڵی ئەوەدابوو کەشێکی وا بڕەخسێنێت هاورێکانی بێنێتە ماڵ لەبری ئەوەی لەگازینۆکاندا دابنیشن، وابۆ چل ساڵێك ئەچێت ئەم دوانە پێکەوەن و ژنەکەی ئەڵێت : دوای ئەوەی ئالودەی ماڵ بوو ئیدی لەماڵ دەرچون بەلایەوە کارێکی گەلێك سەختە ...!

خاتو "شورت" ئەڵێت :بەڕای من گەورەترین خزمەت و خۆشەویستی ژن بۆ مێرد ئەوەیە هۆکانی سەرگەرمی و ڕازی بوونو ئاسودەیی لەماڵدا بۆ دەستە بەر بکات، من ئامانجم لەژیاندا تا ئەو شوێنەی بۆم ئەلوێت بۆ مێردەکەم مایەی دڵپەسەندی و ڕەزامەندییم.

ئەمجۆرە کەسانە لەهەوڵی ئەوەدان هەمیشە یارو یاوەری چاکی مێردەکانیان بن، ئێوەش گەر عەودالّی بەختەوەری و کامەرانین بەمجۆرە دەسبەکاربن.

## ۲٤...هاندانی پیاو بۆ هەبوونی سەرگەرمی

دەقگرتن بەتاکە شتێکەوە دەبێتە نەریت و خو پێوە گرتنیش مایەی نەوەزەلیە، هەبونی سەرگەرم کەرێك بۆ پیاو نەبێتە هۆی پاراستنی لەو سستییە، نەوەبو وتم نیەکێ لەرێگە شادی ئامێزەکانی پیاو نەوەیە بەشداربیت لەحەزو خواستەکانیدا، بەلام هەبونی سەرگەرمیەکی تایبەت بەخۆت کاریگەری لەسەر شادمانی پیاو هەیە .

"اندرە موروا" لەکتێبی هاوسەرداریدا نەلێت:

هیچ هاوسەرداریەك بەردو کامەرانی ناچێت مەگەرئەوەی سەلیقەو بیرو رای ژن و مێردەکە پارێزگاری لیبکات ؛ گەر چاوەڕوانی نەوە بین دوانی خاوەن یەك سەلیقە یەك نایدیاو خواستی هاوشێوەیان هەبێت، ئەوا بۆچونێکی مەحالّ و دور لەراستیە، هەربەم پێیەش پێویستە گۆشەیەك لەمالّدا تەرخان بکرێت تا ئەو بەسەرگەرمبونی نارەزوکانی چێژ ببینێت، دورنیە مێردەکەت حەز بەکۆکردنەوەی پولّ بکات یان هەر شتێکی دیکە ئەو خوازیاریەتی، بەهەر حالّ ئەمانە دورنیە لەبەر چاوتان نەفامانە بێت ...لیان هیچ هەستێکی نێوەی پێ نەبزوێت، کەواتە مەیکەرە مایەی ئاژاوەو لەبەرچاو خستنی، وەخت و ناوەخت مەیدەرەوە بەرویدا.

"هومر کروی"بۆ ئامادەکردنی فیلمێك لەسەر ژیانی "دیل روجرز"یەکێ لەشوانە ناودارەکانی خواروی ئەمریکا ناچار بوو ماوەیەك بچێتە "کالیفۆرنیا-سانتا مونیکا"تا جێی ژیانی خۆیو ئاژەلّەکانی لەنزیکەوە بزانێ و زانیاریان لەبارەوە کۆ بکاتەوە.

ئەو پێی ووتم: سەردەمێك کەمیوانی "دیل روجرز" بوو هەوەسێکی سەمەرەی هەبوو، ئەیویست داسێکی گەورەی هەبێت، ژنەکەیشی لەوە نەنەگەیشت

ئەم شتە مەترسیدارو ناپەسەندەی بۆچیە، پاش ماوەیەك فەرامۆشی بیری كردەوە بۆ لەسەر شتێكی لاوەكی بێدڵی مێردەكەی بكات، هەربۆ خۆی چویە شارو داسێكی گەورەی بۆكڕی ئەوجا بەخۆشەویستیەكی تایبەتەوە پێشكەشی كرد ..

"روجرز" وەكو منداڵێك لەبەیانی ڕۆژی جەژندا چەند دڵخۆشی جەژنانەوخەڵاتە ئەویش بەوەر گرتنی ئەو داسە هەمان خۆشحاڵی بۆ هات، بەشێكی زۆری كێڵگەكە كە مەبەستی بوو دەستی كردە هەڵپاچین لەدڕكوداڵ وڕێگەیەكی بەرفراوانی لێدروستكرد، ئیدی لەوە بەدواوە هەركاتێ توشی كێشەیەك بهاتایە داسەكەی هەڵئەگرت و دەستی بە هەڵپاچینی دڕكو داڵ ئەكرد، پاش ماندو بون بەرەو ماڵ ئەگەڕایەوە.

ئەو هەمیشە ئەیوت:باشترین و گرانبەها ترین خەڵاتێك تا ئەو كات بەدەستی هێنابێت تەنها وەرگرتنی ئەو داسە بو، ژنەیش بەلایەوە هەرچەند كارێكی مناڵانەبوو ڕەزامەندی مێردەكەی پێبەدەستهێنا، ئایا ئەتوانن خەیاڵ بكەن كاركردن بەو داسە چ ئاسودەییەك بەو پیاوە ئەبەخشێ...؟

تەنها هەر پیاو نیە سودی ماددی و مەعنەوی ببینێت هەندێ جاریش قازانج بۆ ژن ئەگەڕێتەوە .

"جیمز هاریز"دانیشتوی "تولزا"مێردی ئامۆزایەكمەو پیشەكەی پشكنین و ساغكردنەوەی چاڵە ئەوتەكانی كۆمپانیایەكی سوتەمەنی گەورەیە، ئەو حەزلەوە ئەكات كاتی دەسبەتاڵیەكانی خەریكی مۆبیلەكانی ناوماڵ بێت و نوێیان بكاتەوە، ژنەكەیشی لەدەسڕەنگینی ئەو چێژ ئەبینێ، چونكە هەمیشەماڵیان ڕازاوەیە ، هاوشان "تولە سەگێكی" سكۆتلەندی زیرەكی هەیەو فێری هونەری پیانۆ لێدانی كردووە لەمیوانداریەكاندا خۆی ئەنوێنێ یەكەجار بەهەردو دەستی و پاشان قاچەكانی و دوایی بەهەر چوار پەل پیانۆكە لێئەدات.

سەرگەرمیەکان ئەتوانن چارەی گرژی دەمارە ماندووەکان بکەن، ئەزمونی [illegible]"لەزیندانی ژاپۆنیەکان لەکاتی جەنگی جیهانیدا باشترین نمونەی باسە :

ساڵی ١٩٤١ بەڕێز "کلارک"کەیەکێك لەئەندامانی بازرگانانی شانگهای لەگەڵ ژنەکەی"روز"لەشاری لانگوا.. لەلایەن ژاپۆنیەکانەوە دەسگیر کران، ئەوان ماوەی ٣٠ مانگ لەگەڵ ١٨٧٤ کەسی ئەمریکی و بەریتانی بەبرسێتی و پەرێشانی لەبەنداندا ئەژیان، لەدیمانەیەکدا بەهۆی گۆڤاری"ساینس"ەوە ووتی:

بەم ئەزمونە بۆم دەرکەوت تەنانەت گەرکەسێك لەمالو ژیان و کارو سەروەت و سامان بێبەش بێت، بەڵام هاوکات گەر پەیوەندیەکی لەگەڵ سەرگەرمیدا هەبێت هەرگیز دەرونی توشی دارمان نابێت، دیارە مەبەستم سەرگەرمیە بەسودەکانە، هیچ کەسێك تواناى ئەوەی نیە نەیەڵێ حەزلەمۆسیقاو ئەدەبیات نەکەین، کەسێکیش نأتوانێ توانای تێگەیشتنمان لەشیعرو شاکارە گەورەکان لێ زەوت بکات.

خاتو "کلارک" زانیاریەکی سادەی لەبارەی پەیکەری مێژویی و داتاشراوە کۆنەکانەوە هەبوو، ئەوباس و دەربڕین و ڕونکردنەوەیەی بۆزیندانیان دەرئەخاوت و ئەوانیش لەژێر کاریگەریە ئەفسوناویەکانی ئەم خانمەدا بارودۆخی منەتباریان فەرامۆش کردبوو، مێردەکەیشی خەریکی ژەندنی مۆسیقای مەزهەبی بوو، بەرلە هەڵایسانی جەنگ ئەولە شانگهایدا کۆمەڵەی سرودخوانانی دامەزراند، "کلارک" تانەوڕادەیەی ژاپۆنیەکان بواریان دابویە کۆمەڵێك ڕیتم ناهەنگی ساز کردبوو،مێردەکەیشی کۆمەڵێکی فێری سرودە مەزهەبیەکان ئەکرد.

"کلارک " ئەڵێت:ئامۆژگاریم بۆ ژن و مێردان ئەوەیە ..سەرگەرمیەك بۆ خۆیان دیاری بکەن بێتە مایەی شادمانیان .

گـەنجێك دەڵـێ : گـەرژنێك بدۆزیتـەوە بەهاوڕێـیەتی بچـێتە دڵیـەوە لەهەمانکاتدا گەر پێویستی بەتەنیایی هەبوو نەبێتە ئاستەنگێك بـۆی، بێگومـان دەسبەجێ هاوسەرداری لەگەڵدا نەبەستێت .

ژنانی ماڵ چونکە زۆرینەی کات تـەنیان لەماڵـدا توانـای دەرك پێکردنـی ئەمجۆرە نارەزوە سـەیرەی پیاویـان نییـە، ئـازادکردنی پیـاو بـەلای خۆیـەوە مانـای تەنیایی ناگەیەنێ، بەڵکو بۆشاییەکی سەربەخۆیە ئەو لەکۆت و بەندی داواکاری ژان دەرباز ئەکات ...! بوارێکە تیایدا دەبێتە پاشای دڵ و دەرونـی خـۆی لەسـای ئـەو فەزایەشەوە سەربەخۆیی و چالاکی تێدا بەدەست دێنێ .

هەندێك لەپیاوان خوازیـارن هـەر پـانزە ڕۆژ یـان مـانگی جارێـك لەگـەڵ هاوڕێکانیدا بچێتە گەشت یان یاری یان ڕاوکردن هەندێکی دیکـە حـەز لـە گۆشـە نشینی یان خەڵوەت و خامۆشی یان کتێب خوێندنـەوە...هتـد، بەهـەرحاڵ کەسـی زرنگ ئەوەیە هیچ جۆرە کۆسپێك دروست نەکات لەهەرجۆرە تەنیایی و حەزێك.

مـن بۆمدەرکـەوت پـێش هاوسـەرداریمان مـاوەی بیسـت سـاڵێك ئـەبوو مێردەکەم هەمو ڕۆژێکی یەکشەممە لەگەڵ "هومرکروی"نوسەردا دیانـەیان هـەبوو، هاوسەرداری"دیل" لەگەڵ مندا بەئەقڵدا نەئەهات ئەو دەسبەرداری ئەو حەزەی بێت کە ماوەی بیست ساڵە نالودەیەتی،منیش لەبەرخۆمەوە ئەموت: ئەو کە هەفتەیەك لەگەڵ مندا بێت ئیتر چی تێدایە گەر ڕۆژێکیش بۆخۆی بێت، دەسبەجێ بـۆ ڕۆژانـی یەکشەممە بەرنامەیەکم ڕێـك ئەخسـت تـا پێویسـتم بـەو نـەبێت، ئـەوانیش چـێژی خۆیانیان وەك سـەردەمی بێـژنی ئـەبینی، دیـارە هـەمو ژن و مێردێـك پێویسـتە لەمانگێکدا چەند جارێك لەکۆت و بەندی ژن و مێردایەتی ڕزگاریان بێت .

## ئێوەش سەرگەرمیتان پێویستە ....

هەندێك لەژنان پێیان وایە سەرگەرمی لەکاتیان ئـەگرێت لـەکارو بـاری ماڵیشدا دوایان ئەخات ، بەڵام بەپێچەوانەوە برستێکی زیاتری ئەداتێ، ئەو ژن و مێردانەی ساڵانێك بەسەر هاوسەرداریانا تێپەڕیوە هیچ جۆرە سەرگەرمیەك شـك ناسەن لەدانیشـتن و کۆبونـەوەیان لەگـەڵ ئەنـدامانی خێزانیشـدا بابەتگـەلێکی ئەوتۆیان پێ نییە بەکورتی هەمبانەکەیان خاڵی و پەتییە ...!

هەڵبژاردنی سەرگەرمیەکی دەرەوەی مـاڵ یـەکێکی دیکـە لـەو بنەمایانەیـە ژن ئەکاتـە هـاوڕێو هاوسـەری پیـاو، هەربەهـەمانجۆر پیـاو دوای خـەریك بـوونی بەسەرگەرمییەکەوە چالاکی و توانایی چاکتر کارکردنی دێتەوە بـەر ژنـیش گـەر چالاکیەکی دەرەوەی ماڵی بۆ بڕخسێت ئەرکەکانی ماڵی باشتر بۆئەچێت بـەڕێوە، ژیانی یەك قاڵب و نەگۆڕ شەکەتی و سستی جەستەیی و دەرونـی دێنێتـە گـۆڕێ نەك کاری زۆرو پڕزەحمـەت، زۆرینـەی خـەڵك هێنـدەی ڕەنـج ئـەدەن بـۆ نـان و پەیداکردن هێندەش لەگەمەو یاریدا توانـای ئەسـتەکان بەخـەرج ئـەدەن، تـەنها کارگۆڕین و جۆری چالاکییە تـین و ورەی نـوێ بەرهەمـدێنێ مانـدوێتی جەسـتە ئەحەوێنێتەوە.

بۆ خانمانی ماڵ کات و ساتە دوایەکەکانی تەنهاو بێکار بەسـەر ئەبـەن، تێکەڵ بونی خەڵکی و چالاکی دەرەوەی ماڵ گەلێ بەکـەڵك و بەسـودە بـۆ نمونـە خوێندنی خولی ئابوری ماڵ ؛ یـان بـەرگ دوریـن و خـولی مۆسـیقا ئەنـدامێتی ئەنجومەنەخەیریەکان هەستی بوون بەرەو باڵاتر ئەبات .

خاتو "والتر فنك" دانیشتوی "تکزاز"کاتێ منداڵەکانی ئەنارده قوتابخانە ڕۆژانی یەکشەممە لەکلیسادا خۆیشی وانەی ئەوتەوە ، لێرەدا بۆی دەرکەوت ئامادەییەکی گرنگی لەپەروەردەی مێرد منداڵاندا هەیە، ئەو ئەڵێت : ئەمکارە بەلامەوە بویە موعجیزەئەوکات بەدەست خاوێنی و ڕێکخستنی ماڵەوە گیرخواردبوو، ئەخۆشی دودڵی و ڕاڕاییم بوو، ئێستا چونکە دیدگایەکی فراوانترم هەیە کاتەکانم لەشتی بێنرخدا بەخەرج نادەم .

من سەرپەرشتاری کۆمەڵێك لەکچانم ، شەوانی پێنج شەممان ئەچمە کلیسا، لەبارەی ڕەوشتە مەزهەبییەکانەوە گۆێگرم ، ڕۆژی دوایی وانە ئەڵێمەوە، ئەمانە بەرنامە گەلێکیان بۆ سازداووم، کاتی ناخواردنی ئێوارە لەگەڵ خێزانەکەمدا باسی گێڕانەوەی ڕوداوو بەسەرهاتەکانی ڕۆژ دەبنە گوڵی دانیشتنەکەمان .

لەگۆڤارێکی تەندروستیدا باسێکم بەرچاو کەوت سەبارەت بەمنداڵێك توانی خواردن هەرسکردنی نەمابوو لە نەخۆشخانەدا لەژێرچاودێری دەرونیدا بوو ، پسپۆران هۆکاری نەخۆشیەکەیان دابویە پاڵ دەمە قاڵەو ئاژاوەی دایك و باوکەکەی لەکاتی ناخواردن..!هەربۆیە شادمانم چالاکیەکانی دەرەوەی ماڵ ئەوبوارەی بۆ ڕەخساندووم تاکو باسە سەرنجڕاکێشەکان بۆ خێزانەکەم باس بکەم.

هەڵبژاردنی سەرگەرمی و کارێکی دەرەوەی ماڵ وابەستەی خواست و سەلیقەتانە، بیر بکەرەوە بزانە هەمیشە چێژ لەچی دەبینی .. ئامادەییت لەچ کارێکدا خۆی دەبینێتەوە....؟

من ئەندامی گروپی "شکسپیر"م لەنیویۆرك بەڕاستی لەمکارە چێژێکی زۆری لێئەبینم زۆریش ئاسودەم ، لێدوان و بەدوادا چوونی دەستەیەك لەو خەڵکەی دەربارەی کەسێك کە هەمیشە جێ ی خواست و ئارەزووم بوە وێڕای ئەوەش ئاشنابونی دنیای چوارسەد ساڵ بەرلە سەدەی بیستەم ، لەوەش گرنگتر

..لەگەڵ مێردەکەمدا دائەنیشم لەبری نرخی خۆراك و قەیرانی بازاڕ باسێگی
[illegible]ەورەتره سەرنجڕاکێشترم پێیە بۆی، ئەویش بە موتاڵای ژیانی "ابراهام
لینکۆلن"پەیوەندیەکی تایبەتی هەیە کاتێ هەردوکمان لەبارەی ئەم دو پاڵەوانەوه
[illegible]و را ئاڵو گۆڕ ئەکەین زانیاری زیاترمان لەیەکترەوه چنگ ئەکەوێ ، بێگومان
هەردوکمان حەزمان لەیەك شت بکردایە هێندە چێژمان لەیەکتر نەئەبینی،
بەهەبونی دو بابەتی جیاواز دوربینیەکانی ژیانی یەکتر فراوانتر ئەکەین .

"سامونیل و- استر کلینگ"لەکتێبی ڕێنمایی هاوسەرداریدا ئەڵێت:

گەر ژن و مێرد لەناخەوە کارەکانیان بەهاوبەشی و لێك چویی بەئەنجام
بگەیەنن ئەوە زەبرێکی گەورە لەپەیوەندییەکانیان ئەکەوێت ژینێکی ماندو
نامێزین دەبێ، هەبونی سەرگەرمی جیاواز ورەیەکی پتر بەژیان ئەبەخشێ ورەیەك
ژیانی هاوسەرداری بەتەڕو تازەیی لەدەروندا ئەهێڵێتەوە.

گەر هەست ئەکەن ژیانی هاوسەرداریتان سست و سەرباره ، ئەوا پێویستیت بە
گوڕو تینێکی تازە هەیە لە سەرگەرمیەکانی خۆت و مێردەکەتدا موتاڵایەکی
وردبینانە بکەو بزانە ..ئایا بەڕاستی هاوڕێ و هاوسەرێکی بەکەڵك و چاکی بۆ
ئەو ...یان ..نە ء...؟

## ٢٦... گرنگترین پیشە (ماڵداری)

مەخابن ئەو خانمانەی خەریکی ئەرکی ماڵن بەهای خۆیان و کارەکانیان نازانن، چونکە کەیبانوی ماڵ بەڕێوەبەرێکی چاپوك و لێهاتوە کاری کۆمەلێکی لەسەر شانە، پسپۆڕانی بواری کۆمەڵناسی پێیان وایە:گەرژن بەتەنیا هەوڵەکانی لەخزمەت خۆیدا بوو، لەڕوانگەی کۆمەڵایەتیەوە بەهایەکی ئەوتۆی نابێت، دورنیە وابێت..!

کەژنێك ئەڵێت : من تەنها ژنی ماڵم، لێرەدا حاڵەتێکی بەرگری کردن لەخۆی وەرئەگرێت و بیچزارە لەکارەکەیی و نارەزایی دەرئەبرێت، بیگومان ئێوەش بیستوتانە کە چەند بەڕەشبینیەوە ئەلێت : من تەنها ژنی ماڵەوەم.ئایا ئەوەندەی من بەم رستەیە پەست ئەبم ئێوەش هەمانشێوەن...؟

بێگومان هیچ کارێك لەدنیادا هێندەی ڕێکخستن و پەروەردەی ماڵ و منداڵ پڕبەهاو بەپێز نییە، خزمەتێك ژنێکی ماڵ و دایکێکی بەسۆز بەکۆمەڵگەی ئەکات لەگرنگترین خزمەتی سیاسەتمەداران پڕبەهاترە.

تەنها ژنی ماڵەوە ...! ئەم دەستەواژەیە وەك ئەوە وایە لەکۆنفراسێکی نێودەوڵەتیدا بێیتە گۆو بڵێیت : بەڕێزان من پێم وایە خودی خۆم بەهاو نرخێکی ئەوتۆم نییە، من تەنها سەرۆك کۆمارێکم ..!

ژنێك تەواوی تەمەن و کاتی لەرێی ماڵداری و پەروەردەی منداڵداو خۆشی وبەختەوەری ئەو خانەیە خەرج بکات ئەبێ سەرفەرازو مایەی شانازی بێت، ئەرکە هەمەلایەنەکانی ژن لەماوەی هەفتەیەکدا وەك ئەخشەیەکی هونەرییەو

هونەرمەندەکە لەماوەی چەند مانگێکدا چەندین جار پرۆڤەو بلیمەتی خۆی تێدا دەدارێنێت.

ئایا ئائێستا بیرت لەوە کردۆتەوەژنێکی ماڵ تاچ ئەندازەیەك کاری تایبەتی و هونەری ئەنجامنەدات، جل شۆری، ئوتو کردن،بەرگدورین، پاکو خاوێنی ناوماڵ، داری جۆراو جۆری میوانداری شۆفێری ، دیکتە کردن، وردبینی کارو باری دارایی، پەروەردەی دەرون و ڕەوشتی منداڵ پسپۆڕی پەیوەندیەکۆمەڵایەتییەکان ، کارگوزار، ڕاوێژکار...هتد جوانی و ڕازاوەیی ڕوخسارو پۆشاك و ئارایشتی تایبەت تاسەرنجی پیاوەکەی بەلای خۆیدا ڕاکێشێت..!

من هیچ کاتێ ڕێم نەکەتۆتە ئیدارەیەك هەرلەبەر ێوەبەرێکی گشتیەوە تاکارگوزارێکی سادە، هەموو ئەرکەکان لەئەستۆی تاکە کەسێکدا بێت ، کەچی ژنی ماڵ ئەکە سەرۆکی گشتییە هەموو ئەرکەکانی لەئەستۆدا بێت زۆر چاکیش بەڕێوەی بەرێت ، زۆر ئاوات خواستەم هەموساڵێك خەلاتی چاکترین ژنی ماڵ بکرایە ، هەڵبەتە ژنی ماڵ بەدەرامەتێکی کەم و کورت و کەرەسەی ناتەواوەوە باشترین جۆری ئەرك ڕانەپەڕێنێ بەڕای من ژنێکی ماڵگونجاو پاککار ئابڕوی مێردەو لەتەواوی ژنانی سیاسەتمەدارو هونەرپیشە ئامادەیی زیاتری لەبارەدایە ، ئایا ئەزانیت ماڵداری چ کاریگەریەکی گەرمی لەسەر بەختەوەری مێرد هەیە..؟ لێرەدا وتەی "دکتۆر مارینا فارنهام-فردیناندلاندبرگ"نوسەرانی کتێبی بەناوباگ" ڕەگەزایەتی نادیار و نوسەرانی گۆڤاری ژنان وەك خۆی ئەنوسمەوە : لێتوێژینەوە سەلماندی دەرامەت و سەرمایەی پیاو بەجۆری حەتمی و دڵنیا بوون بەهۆی بەڕێوەبردن ولێهاتویی ماڵداری ژنەوە ٣٠٪بۆ٦٠٪سەردەکەوێ . گۆڤاری لایف لەڕیپۆرتاژێکدا ئەنوسێت گەر پیاو بیەوێت ئەرکەکانی ماڵ بەکارەکەرێك بسپێرێت ئەوا لەساڵێکدا ئەبێت ١٠٠ هەزار دۆلاری سەردەمی دانانی ئەم کتێبە

بدات ، زۆری ئەوپیاوانە شۆرەت و نابانگی نێو دەوڵەتییان هەیە تەنها لەسای ڕەوشت بەرزی و لێهاتویی ژنی ماڵەوە گەشتونەتە ئەو ئاستە .

لەگۆڤاری "ژنی ئەمڕۆ"خاتو"مێ.مێ. ایزنهاور"ڕاپۆرتێکی لەژێرناوی "گەرئەمڕۆ تازە بوك بم"ئەڵێت:

شوکردن و بونە دایك ...بەرزترین پلەیە کە سروشت و ژیان بەژنی بەخشیوە، هەنێك جار جڵ شۆردن یان خاوێنکردنی منداڵ لەوانەیە بێزارتان بکات بەتایبەت کاتێ مێردەکەتان گوزارش لەبارەی کارەکانی خۆی ئەدات و پاشان لێتان ئەپرسێت : دەی ئەزیزم بزانم ئێوە چیتان کردووە .. ؟لەوەڵامدا تۆیش ئەڵێیت: ...هیچ ....پارەی کارەباکەم بردنەنجامی بەردەوامی و تەواو نەبونی کاری ماڵ بەپروپوچ و بێبەها دێنە بەرچاوت بۆیە وەڵامەکەت بەوجۆرەیە ، بەڵام سەردەمێك هەست بەوە ئەکەن سەرگەرم بوونی بەکاری نیداری و دەرامەتی چاك سەرنجتان بەلای خۆیدا ڕائەکێشێت ، بەڵام بەمەرجێ خۆت نەدەیتە دەست ئەو دڵە ڕاوکێیە ئەوە حەتمەن بەرەو قازانجی چاکتان لەژیاندا کردووە، بەڵام گەر لەبەر کارێکی نیداری ماڵ و ژیان بێسەرپەرشت بکەیت پلەو جێگەیەکی نیداری بۆخۆت بەدەست بێنی ئەوادوای بیست ساڵی دیکە دەبێتە ئەوەی ئەمڕۆ، خۆتان و مێردەکەتان ئەو کارو ماڵەی هەردوکتان فەرامۆشتان کردبوو، ئەگەر من ئەمڕۆتازە مێردم بکردایە هەمان کارێك بەدرێژایی چەند ساڵی ڕابردوو ئەنجامم دابوو ئەمکرد بەدەرامەتێکی کەم ماڵ و منداڵم ئەبرد بەڕێوە، هەرچیش لەتوانامدا هەبوایە درێغیم نەئەکرد بۆکۆمەکی ئەو تا ئەو ئاستەی خوازیاریەتی، ڕەوشی سەرەوە لەیەکەم ڕۆژی مێردکردنمەوە بەرنامەی ژیانم بووە لەمەش چێژێکی گەورەم بینیوە، شانازی ئەکەم لەماڵو مێرددا بەهەوڵو کۆششی تەواوەوەئەرکەکانم جۆرێك ئەنجامداوە کەڕێڕەوی کەشتی ژیان هەمیشە ئارام و بێ

ا، رریان بووە، پیشەی ماڵداری و پەروەردەی منداڵ بەلامەوە بەتام و سەرگەرم ا،، بەلەزەت بووە، هەرگیز لەم پێگەو كارەی خۆم شەرمەزار نەبووم و پێم ،،ک نەبووە

خاتو.مـی.مـی. ایزنهـاور.بەشـانازییەوە(وەکـو ژنێکـی بـەد مـاڵـداری ـەکردووە)ئـەو کۆمـەکی مێردەکـەی کردتاگەیشـتە بـەرزترین پلـەی دنیـا ،انە(کۆشکی سپی)و بویە سەرەك كۆماری ولأتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا

## ٢٧...لانەیەکی ئارامبەخش

وارِسکاوە هەموو مرۆڤێك لەکاتی دەسبەتاڵی و پشوودا ژیانی جۆرێك لێبکات بەدڵی خۆی بێت، مافی ئەوەت نییە لەشەقام و رێگەو بان جۆرە رەفتارێ بنوێنی مایەی بێزار بوونی خەڵکی بێت، بەڵام لەماڵی خۆتدا ئەو مافەت پێدراوە، بەئارەزوی خۆت پێیە لێ راکێشیت و بەدڵی خۆت بخۆیت و بپۆشیت، گەر لەم جوغزەدا کۆسپێك هەبێتو نەیەڵێ بەدڵی خۆت بکەیت بجولێیتەوە بێگومان لێت دەبێتە دۆزەخ ...

ئایا سبەینان کەمێردەکانتان ئەچێتە سەرکاربەورەو تینێکی دەمەزەردکراوەوە لەماڵ دەردەچێت ...؟

ئایا کە بەماندوێتی بەرەوماڵ دێتەوە بەچ شێوەیەك بەرەو پیری ئەچیت....؟

وەڵامی ئەم دوپرسیارە زیاترە لەوەی لەمێشکی ئێوەدایە نزیکە لەسەرکەوتن یان دۆڕاندنی مێرد....!

دکتور "کلیفوردار.ادامز"لەگۆڤاری"لیدز هوم جنرال"ئۆرگانێکی ماڵداری ژنانە لەژێرناونیشانی : چۆن بتوانیت هاوسەرداری لەبەختەوەری نزیك بکەیتەوە دا دەڵێت:

چەمك و مانای ماڵ سەبارەت بەمێردو منداڵەکانتان وابەستەی ئاکارو رەفتارتانە دیارە ئەوانیش لەو پێکهاتەیەدا بەشدارن بەڵام هەڵسوکەوت و رەفتارتان سەرمەشق و رێنمایەتی، ئێوە ئەکەم بەرپرسی وەدیهێنانی

پەروەردەیەکی پرسۆزو ئاشتی و خۆشەویستین ، ئەخشەو بڕیارتان بۆ بەدیهێنانی ماڵ و خێزانێکی ئارام و بەختەوەر ڕۆڵێکی کاریگەری هەیە .

بۆئەوە پیاو بتوانێت بەو پەڕی کارامەییەوە کارەکانی بەئەنجام بگەیەنێت پێویستە لەماڵدا ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکات :

**یەکەم :**

پشودانی تەواوەتی:

هەرچەندە پیاو کارەکەی لەلا شیرینەو بەتامەزرۆییەوە ئەنجامی ئەدات ، بەڵام لەکاتی ئەنجامدانیدا مێشك و دەمارەکانی دوچاوی شەکەت بوون ئەبن، کاتێ بەرەو ماڵ ئەبێتەوە ئەم شەکەتی و ماندوبونەی لەباربەرێتبێگومان بۆڕۆژی دواتر سەرلەنوێ باشتر تێ هەڵئەچێتەوە.

هەموو ژنێك خوازیارە خانەدارو کەیبانویەکی چاك بێت ، بەڵام هەندێکجار سەلیقەی هێند لەزیاد بووندایە کەپیاو لەماڵدا بواری پشودان و ئازاد بوونی لەو کۆت و بەندە نییە، بیرم دێت کاتێ منداڵ بووم ژنێکی دراوسێمان هەبوو هەرگیز نەیدەهێشت منداڵەکانی یاری و گەمە لەماڵدا بکەن، مێردەکەشی هەمانشێوە مافی جگەرە کێشانی لەو ماڵەدا نەبوو، چونکە دارو پەردو بۆنی دوکەڵی جگەرەی ئەگرت، گەر مێردەکەی بیویستایە کتێبێك یا ڕۆژنامەیەك بخوێنێتەوە ئەبوایە بەوردی و دەستبەجێ لەشوێنی خۆیدا دایبنایەتەوە، ئایا بەڕای ئێوەش ئەمجۆرە ڕەفتارە نیشانەی شێتی نییە...؟

دکتۆر "روبرت .پی.ادن والد"پسپۆڕی نەخۆشییەدەرونییەکانی زانکۆی کاتولیك لەوتارێکیدا لەیادی بیستەمین ساڵڕۆژی دامەزراندنی"نشناڵ کاتولیك..فامیلی لایف"ڕایگەیاند ئەو ژنانەی لەپاك و خاوێنیدا ڕاڕایی و

گومانیان هەیە گرێکوێرەیەکی گەورەیان لەکارو باری فەرهەنگی و پەروەردەیی لەئەمریکادا وەدیهێناوە ...!

جوانی خۆشەویستی شانۆنامەی بەناوبانگی ژنەکەی"کریگ"بەپێنوسی "جورجکلی"چەندین ساڵ نمایش نەکرا بویە هۆی پێدانی خەڵاتی "پولیتنرر"تەنیا لەبەر ئەوەی نمونەی"هریت کریگ"لەزیاد بووندا بن، ئێمە ژنان کاتەکانمان بەخاوێنکردن و ڕێکخستنی ماڵ بەسەر نەبەین، کاتێکیش مێردەکانمان جگەرەو ڕۆژنامەوکتێب و کاغەزی دڕاو بڵاو نەکەنەوە هێندە پێی قەڵس و بێزار نەبین گەر دەسەڵاتمان هەبێت کاتێ ئەو ئەو کارانە نەکات پەلاماری نەدەین، بەڵام باشتر وایە پێش ئەوەی سەرو چاوی لێبدەین بەیەکدا بەکەسێکی کەمتەرخەمی بدەینە قەڵەم پێویستە بزانین ماڵ لانەیە جێی پشودان و حەوانەوەیەپێویستە دوربێت لەهەموو مەرج و بەندێك.

☜ دووەم

پشودان و نارامی :

ڕازاندنەوەوخاوێنکردنەوە لەئەستۆی ژندایە پێویستە هەموو کاتێك ئارامی پیاو لەبەرچاو بگرێت کەلو پەلی نایاب لەخزمەتی ئەودا بێت تا بەئاسودەیی پێی پشودانی لێ ڕاکێشێت .

دکتور"لوئیس.سی"پزیشکی تایبەتی خێزانەکەمانە دانیشتوی شاری نیویۆرکە ، ئەم بەڕێزە ژنی نییە، بەڵام هێندە سەلیقەی لەگەڵ ڕازاندنەوەی ماڵەکەیدا هەیە ئەڵێی هەمیشە دوژن لەمم ماڵەدا خەریکی ئەو جوانکاریانەن...!

"والتر لینگ"بەڕیوەبەری کۆمپانیای سوتەمەنی یەکێکی دیکەیە لەو پیاوە بێ ژنانەی کەلو پەلەکانی بەدەستی خۆی ڕێکخستوون و خانویەکی تێکجار سەرسوڕهێنەری لەنیو یۆرکدا ڕازاندۆتەوە ...!

کەچی زۆرجار کەماڵ ئەڕازێنینەوە هێندە گوێ نادەینە جێگەو پێویستیەکانی ئەو ...!

لەگەڵ مێردەکەمدا سەردانێکی پاریسمان کرد، من حەزم لەچەند ژێرجگەرەیەکی ئەنتیکە کرد و کڕیمن .. ئەزانی مێردەکەم چی کرد ...؟

هەرکە گەڕاینەوە ئەمریکا ئەو چووە موغازەیەکی بلور فرۆشی چەند ژێرجگەرەیەکی بلورینی کڕی هەرکاتێ میوانی جگەرەکێشمان بهاتایە ئەوانەی ئەو کڕیبونی بەکارم ئەهێناو ئەوانە لەفەرەنسا کڕیبومن لەتاقی نمایشگەدا دامنابوون بۆ جوانی...!

☜ **سێیەم :**

پاکو خاوێنی :

زۆربەی پیاوان پێیان خۆشترە لەچادرگەیەکی ڕێك و پێکدا بژین نەك لە کۆشکێکی پەرژو بڵاودا، ماڵی واهەیە هەرلەناخواردنی بەیانی تاکو ئێواری قاپ و قاچاخی پیس و پۆخڵی لێنابڕێت ژورو هەیوان و دەستشۆر پەرژو بڵاوە ئەمەش والە پیاو دەکات بێزاربێت پەنا بەرێتە بەر شوێنێکی دیکە.

مێردەکەم خوالێی خۆشبێت ووتی: پێشنیاری کچێکی قەشەنگ و جوانم بۆ هاوسەرداری ڕەتکردەوە ئەویش بەەوهۆیەی ڕۆژێك سەردانی ماڵەکەیان ئەکات ئەیووت هێندە ماڵەکەیان پەرژو بڵاو بووە هەر ئەتووت شێلم و توری تێدا چێنراوە...!

من هەمیشە سەبارەت بەشپرزی و نارێکی ئەدوێم و دوپاتی ئەکەمەوە.

**چوارەم**

بەرپرسی ئاشتی و تەبایی بەدڵنیایی تەواوەوە تەنها هەر ژنە، ئەوەش بزانە سەكەوتن و ترقی پیاو لەكارو پیشەكەیدا وابەستەی ئەو جوغزەیە كەدەسكردی ژیری و زرنگییە.
لەلەلێكۆڵینەوەیەكی گۆڤاری "ڤۆرچون"دا هاتووە یەكێ لەبەڕیوەبەری كۆمپانیا گەورەكان ڕای خۆیدەربڕیوەو ئەڵێت : ئێمە هەوڵەكانما ئەخەینە گەڕتاهۆكارەكانی ڕەزامەندی و ئاسودەیی كارمەندان فەراهەم بێنین، بەڵام كاتێ ئەوان لەماڵدا بێزار ئەكرێن، كاتی تاڵیان تێدا ئەچێژن ئەوكاتە هەوڵەكانی ئێمەش لەبار ئەچن و پوچەڵ دەبنەوە، زۆرێك لەپیاوان بۆدەرباز بوون لەماڵی دۆزەخ هێند لەكارەكانیان ڕۆدەچن هیچ بوارێك بۆگەڕانەوەی ماڵ ناهێڵنەوە.
دكتور "پول یونیو"سەرۆكی ڕێكخراوی پەیوەندییە خێزانییەكانی"لویس انجلوس"پێی وایە ماڵ ئەبێت وێنەی سەنگەربێت پیاو لەگرفت و كێشەكانی شەوو ڕۆژی پەنا بدات...!
كار كردن لەئیدارەو دەزگاو دامەزراوەكاندا ئەمڕۆ شتێكی لاقرتیانە نییە، پیاو تەواوی ڕۆژ لەكێشمە كێش و ململانێدایە كە دەس لەكار هەڵئەگرێت و بەرەو ماڵ ئەچێتەوەپێویستی بەئاسودەیی و عیشق و خۆشەویستی هەیە ؛ ئەو ژنەی ماڵ بكاتە لانەی پشوو پێداویستیەكانی پیاو ژنێكی كارزان و چاكسازە.

**پێنجەم:**

بەرلەوەی خۆمان لەوە لابدەین، پیاو هەست بكات بوونی ئەو بارێكی گرانە و جوانی ڕازاوەیی كیشوەری پادشایی ژنانە تێك ئەدات و ئەیشێوێنێ ، ئەبێ ئەوە بزانین ئەو وەكو پادشایەكی بەتواناو دەسەڵاتدارەو پێویستە ئەخشەو

بەرنامەکان تاوو توێ پێ بکات . کاتێ ئەتـەوێ کەلوپـەلی جـوان و نایـاب بـۆ مالەوە بکڕیت تەنها پسولەی حسـابەکەی مەخـەرە بەردەسـت بـیروڕاو بۆچـونی ئەویش بخوێنەرەوە وەك چۆن تۆ ئەبێت لەهەموو گۆڕانکارییـەکانی مالـدا مـافی بەشـدار بوونـت هـەبێت ئـەویش بەهەمانشـێوە، پێویسـتە وای بـۆ بسـەلمێنیت بەشداری نەکردنی ئەو یەکێکە لەناتەواوییەکانی مالّ .

باهێندە پێداگیری لەسەر بەرنامەی گران و کۆت و بەنـدی نـەگونجاو نەکـەین تـا چەمك و مانا ڕاستەقینەکەی مالّ لەبار نەچێت .

## ٢٨....کات بێ هوودە بەفیڕۆدان ...

هەموو زیانێك قەرەبوی ئەکرێتەوە تەنها کاتێك نەبێت بەبێهوودە بەفیڕۆ چوبێت، زۆرلەکارمەندانی دەوڵەتم بینیوە بۆ گەیشتن بەسەری مانگ و وەرگرتنی مووچە زۆر بێ ئۆقرەن هێندە شپرزن نازانن لەتەمەنی خۆیان کەم ئەکات ؛ ماوەی ئەو تەمەنە بۆهەرکەسێك دانراوە کاتێکی دیاریکراوە هۆشیار کەسێکە ئەو ماوەیە بێهوودە لەدەست نەدات .

"الینور رۆزڤیلت" یەکێکە لەسەرقاڵترین ژنی دنیا و لەماوەی ٢٤ کاتژمێردا ئەم هەمو کارەی چۆن ئەنجامداوە ...؟

بێگومان کەس ناتوانێ بڵێ کەسێکی سست و تەوەزەلە ، ئەوەی ئەو لەماوەی ڕۆژێکدا کردویەتی گەر ژنێکی ئاسایی نیوەی تەمەنی خۆی بۆ تەرخان بکردایە هێشتا کەمبوو ، ووتاربێژی، نوسینی ڕاپۆرت، کتێب ، نامە، چالاکی بۆ وەبەرهێنانی ئاشتی نێو گەلان ، چەمکێك بوون لەکاری ڕۆژانەی ئەم خانمە.

لەدیانەیەکمدا لەگەڵ ناوبراو لەکاتێکدا بوو لەسەر ڕێ بوو بۆکۆنفراسێکی دیموکراتی لە نیویۆرکەوە بۆ شارێکی دیکە لەمیانەی وتووێژەکەماندا لێم پرسی : چۆن ئەتوانی ئەم هەمو کارە بەشایستەیی بگەیەنیتە ئەنجام ...؟ وەڵامێکی سادە...! ( هەرگیز کات بەفیڕۆ نادەم..!)

ئێمەش هەمان ٢٤ کاتژمێری ئەوومان لەبەردەستایە و کاتی خوێندنەوەیەکی سەرپێیمان بۆ نالوێت...اتوانای وەدەست هێنانی زانیاری و کەسێتی و پەروەردەی منداڵ و ماڵداریان نییە، زۆربەی ئەو کارانە چێژ بەخشن لەبۆتەی فەرامۆشیدا ووشك هەڵهاتوون .

دکتور" پول پینو" لەکتێبی هاوسەرداری پیشەسازی خۆتانە دا ئەڵێت:

هێندەی ژنانی ماڵەوە خۆیان بەسەرقاڵ ئەزانن شایانی بڕوا پێکردن نیە، پێویستە چاك ورد بکرێتەوە گەر هەرژنێك ئاماری کارەکانی لەهەفتەیەکدا بکات بەتەواوی سەرسوڕمانەوە تێئەگات کەهێندە سەری قاڵ نییە، من پێم باشە بۆ ئاگایی خودی خۆتان ئاماری کارەکانی هەفتەیەکتان بکەن و ورد ببنەوە لە١٦ یا١٨ کاژێری بێداری زیاتر چیترت کردووە...؟

گەر ڕاستگۆو بەویژدان بن لەبەرئجامی ئەو ئامارە تەکانێك ئەدەن و لەخەوی غەفڵەت بێدار ئەبنەوە بۆ نمونە ئەبینی کاتژمێر ١٠ بۆ ١١ گفتو گۆی تەلەفۆنیت لەگەڵ فلانە ژندا کردووە لە ١بۆ ٢سلاوو هەوڵپرسی فلانە دراوسێ ٣بۆ٤ گەڕان و پیاسەی بازاڕو بەدەسبەتاڵیش بەرەو ماڵ گەڕاویتەوە ...!

لەشاری نیویۆرکدا بۆ پشکنینی کۆمەلایەتی فێرگەیەك هەیە بەناوی "نیو اسکول" یەکێك لەبابەتە گرینگەکانی ئەم فێرگەیە (ژن لەکۆمەڵدا)ئەمەش بەهۆی خاتو"الیس رایس کوك" ژنێکی کارامە ئەو وانەیە ئەڵێتەوە، مەبەستیش ئەوەیە تاکو ژنان لەکۆمەڵدا پلەو پایەی کۆمەلایەتییان دیاری بکەن و شیاوی پێگەی خۆیان بپارێزن، یەکەمین کاری خاتو "کوك" لەسەرەتای هەپۆلێکدا ئەوەیە دوا لەفێرخوازان ئەکات کارەکانی هەفتەیەکی خۆی یاداشت بکات چاو دێری کاتژمێرەکانی شەوو ڕۆژی بێت ، کەبەچاوی خۆیان کارەکانی خۆیانیان بینی کاتەکانیان لەگفتو گۆی بێهوودەو هامشۆڕەوتی نابەجێ هەندێ شتی تری

لەو بابەتانە ، بەوخۆیدا دێتەوەو بەرنامەیەكی ڕێكو پێكتر بۆ كـاری ڕۆژانــەی دا ئەنێت.

هەندێك لەو كاتانە سود مەندن كەحسابیان بۆ نەكراوە.

كۆچكردوو"هارلان.اف.استون"ســەرۆكی دیـوانی دادگـا مەزنــەكانی ئــەمریكا، جارێك بەفێرخوازێكی ووت: زۆربەی كارە گرینگەكانی دنیا بەسود وەرگرتن لــەو خولەكانەی لەوانەیە بەهەدەر بچن ئەنجام ئەدرێن ..!

جون كی..ڕێخەری فەرهەنگی انیفور میشین پیلیز...كەسێكە هەمیشــە لەتونێلە ژێرزەوییەكانی ئۆتۆمبێلدا كتێب و ڕۆژنامە ئەخوێنێتەوە .

كاتێ ..تیودور رۆزڤێلت"سەرەك كۆماری ئەمریكا بوو هەمیشە كتێبێكی لەسەر مێزی كاركردنەكەی دانابوو لەو چەند چركە ساتانە ئەكەوتە نێوان بۆشایی گفتــو گۆكانی فرسەتی خوێندنەوەی ئەهێنا ...!

جارێك كوڕەكەی ڕۆزڤێلت ووتی :

كتێبێكی هۆنراوە لەسەر مێزی ژوری خەوتنەكەی باوكمە بــەیانیان تــا جلــەكانی لەبەر ئەكات هۆنراوەیەكیش لەبەر ئەكات ...!

بێگومان ئێمە هێندەی سەرەك كۆمار سەرقاڵ نین كەچی بیانوی ئــەوە دێنینــەوە كاتی لەبارمان بۆ خوێندنەوە نییە .

من خودی خــۆم زۆربــەی زۆری داواكاریــەكانی ئــەم كتێبــەم لــەو دوو كاتژمێرەدا نوسیوەكەمنداڵەكەم تێیدا نوستووە زۆریش لەبەدوادا چونەكانم لــەژێر چەتری چاوەڕوانی ئۆتۆبوســەكاندا ئەنجامــداوە، ئەوەشــم بــۆ دەركــەوتووە كاتــێ خەریكی نارایشــتی دەم و چــاووم دەبم ئــەتوانم هاوشــان كتێــب یــان ڕۆژنامــەی سەرمێزی نارایشتەكە بخوێنمەوە.

ئێوەش ئەتوانن وا خۆتان ڕابێنن لەکاتە ٥ خولەکی و ١٠ خولەکیەکاندا دەستی خۆتان بوەشێنن.

ئایا تائێستا حەزت کردووە فێری زمانی بیانی ببیت ...؟

لێرەدا چەند ڕێسایەك دەخەمە پێش چاوتا لەگەنجینەی ئەو گەوهەرە زیاتر سودمە.. بن :

☜ یەکەم : بەوردبینی و تەواوی ئەمانەتەوە بەرنامەی کاتەکانی کاری خۆت دابڕێژەو هەفتەنامەی بۆدروست بکە

کتێبە چاکەکان بخوێنیتەوە ...؟ یا گوێ لەمۆسقا کلاسیکیەکان بگریت ، یان وێنە کێشان ، یان خۆشنوسی ...هتد ئەی هەرگیز نەتوتووە بەخوا من کاتی ئەوانەم نییە..؟ یا بەهەر بیانویەك خۆتت لێ قوتار نەکردووە...؟

بەفیڕۆدانی کات گەلێك لەزیانی پارەو پول گرانترە ، چونکە پارە و پول دێنەوە دەست بەڵام هیچ شتێك ناتوانێ قەرەبوی کاتی لەدەست چوو بکاتەوە، وەك دەڵێن:

## کات وەکو شمشێر وایە گەر نەیبڕی ئەتبڕێت...!

لێرەدا چەند ڕێسایەك ئەخەمە پێش چاو تا لەگەنجینەی ئەو گەوهەرە سود مەند بین:

**☜ یەکەم :**

بەوردبینی و ئەمانەتی تەواوەوەبەرنامەی کاتەکانی کاریخۆت داڕێژەو هەفتە نامەی بۆدروست بکەسەرنج بدەو بزانە زیاتر کاتەکانت لە چیدا بەسەر ئەبەیت .

**دووەم :**

هەمیشە بەرنامەی کاری هەفتەی ئایندە دارێژە، کات و شوێنێکی دیاریکراو بۆ هەرکارێك تەرخان بکە ئەوجا لەدەست شپرزی و دەستەپاچەیی رزگاردەبیت.

کە ئەم ڕەوشە بۆگەورەپیاوانی سەرقاڵ بەسود بێت ، دیارەبۆکەسانی ئاسایی بەرەنجامی بەپێزی لێدەکەوێتەوە، دورنیە رێکەوێت بەهۆی پێشهاتە چاوەڕوان نەکراوەکانەوەلەو بەرنامەیە لادەیت، بەڵام تاهێندەی بۆت ئەلوێت لەڕۆژو ساتەکانی هەفتە چاوی کەمترخەمییان لێ مەنوقێنە.

**سێیەم :**

گەر بەرنامەی خۆراکی هەفتە پێشتر دیاری بکەیت گشت پێویستیەکان لەکۆتایی هەفتەدا بکرێت کەمتر کاتت لەدەست ئەچێت .

**چوارەم :**

ئەو خولەکەکانی بێهودە بەفیڕۆ ئەچن، هەوڵی سود لێوەرگرتنیان بدە لەهەموو حاڵێکدا بەرنامەیەك دارێژە سەبارەت بەکارێك هەردەم تامەزرۆی بیت، گەر کاتێکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نەبوو ئەوا لەو پێنج خولەك و دەخولەکانەدا کە ئەبنە فرسەت و بۆت هەڵئەکەوون سودیان لێ ببینە ئەمەش تاقی بکەرەوە بزانە چ بەرەنجامێکی بەپێزی لێدەکەوێتەوە .

**پێنجەم :**

کارێك بکە لەکاتژمێرێکدا دوخزمەتت پێ بگەیەنێ، خاتو "گازاردی" هەرکاتێ شیری بۆکنداڵەکەی ئامادە بکردایە هاوشان خەریکی شۆردنی کەلو پەل دەبوو یا لەمێشکی خۆیدا بەرنامەیەکی تاوو توێ پێئەکرد، تۆش ئەتوانی کاتی ئامادەکردنی خۆراکێك خوێندنەوەی کتێبێکیان هەرکارێکی دیکە ئەنجام بدەیت.

**شەشەم:**

بەرنامەیەکی ڕیکو پێکی کڕینی پێویستییەکان ڕێک بخەتا کاتەکانت بەفیڕۆر لەدەست نەچێت و زیانی دوبەرامبەری پول و پارەش نەکەن، هەمیشە کەلەماڵ دەرنەچن با پێداویستیەکان لەسەر پارچە کاغەزێك یاداشت بکرێن و بڕی پارەی پێویستت پێبێت.

**حەوتەم:**

کە سەرگەرمی کارێك ئەبیت لەهۆکارەکانی بچڕاندنی بەردەوامی ئەو کارە جڵەو گیری بکە ، هەرکامێکمان کاتێك بێدار ئەبینەوە خولی ٢٤ کاتژمێری دەست پێدەکات و ئەوەش گرنگترین سەرمایەی مرۆڤە، کە ئەڵێم ژیان مەبەستم زیندوو بوونە نەك فریودان و تەفرەدان کێ لەئێمە لەسوری ژیانیدا ئەم ڕستەیەی بۆ نەگوتووە: **هەروەختێك کاتی زیاترم هەبوو ئەم کارەش ئەنجام ئەدەم**....!

هەرگیز لە٢٤ کاتژمێر زیاترمان ناوێت هەرهێندەیەو تەواوی چرکە ساتەکانیش پەیوەندی بەخۆمانەوە هەیە .

## ٢٩.... بەخێرایی کار ئەنجام بدە

ڕێکو پێکی و دیقەت لەهەرکارێکدا مایەی بەپێزی ئەو کارەیە، گەر بۆئامادەکرنی خواردنێکی خۆش هێندە کات خەرج بکەیت فریای کاتی نانخواردنەکە نەکەوێ خۆشی و تامو چێژی ئەو خواردنە هیچ سودێکی ئەوتۆی نییە، بۆ ئەنجامدانی کار لەکاتی دیاریکراودا سود لەم ڕەوشەی خوارەوە ببینە .

خاتو "مرگری ویلسن" نوسەری کتێبی(گەر ئەتەوێ ببیتە ژن-چۆن بتوانی لەسەرو دەرامەتی خۆتەوە بژیت) یەکێك لەپسپۆڕانی هونەری چاکرەفتارییە، جۆری ئاکارو ڕەفتاری بەرزترین نمونەیەکە کە ئەبێتە هەوێنی ڕێساکانی چاکرەفتاری، ئەولە کاتە بێدارییەکاندا کارگەلێکی زۆر ئەنجام ئەدا، تەواوی ئەرکەکانی ماڵ بەتەنیاو بێ یاردەی کەسێك بەڕێوە ئەبات هەرکاتێکیش ڕوبەڕوی‌هاوڕیکانی ئەبێتەوە بەو پەڕی سەلیقەوە جوانی سیماو ڕوخساری وادەرئەخات ئەلێی ڕۆژ تا ئێوارە ئەم ژنە بێکارەو تەنها خەریکی خۆڕازاندنەوەیە هیچ کاتێ شوێنەواری ماندبون و شپرزەیی بەبەژن و باڵایەوە دەرناکەوێ ، وارێکەوت لەگەڵ مێردەکەمدا ئێوارە خوانێك لەماڵیان بووین بێجگە لەئێمە هەشت کەسی تر میوان بوون لەنێوانیاندا کەسانی سیاسەتمەدارهەبوون، لەهەموو ڕویەکەوە میواندارییەکە شتێکی ئەشاز بوو ، میوانەکان بەهەماهەنگی و گفتوگۆی خۆش و بەپێز دانیشتنەکەیان ڕازاندبۆوە چێژێکی ئاسمانی و دورلە وەسفکردن لەدڵی مندا هەڵدەقوڵا هێندە دانیشتنەکەمان گەرم و گوڕ بوو وەك بڵێی لەبەهەشتی دنیایەکی دیکەدام ...!

ئەو خواردنێکی ئێکجار بەلەزەتی بۆ ئامادەکردبوین هەرچەندێك چاووم دەگێڕا کەسێکم بەدی نەئەکرد لەیاریدەدەرو خزمەتگوزارێك بچێت لەدوای ناخواردن لەپەناوە لێم پرسی:چۆن بەتەنیا توانیویەتی ئەم میوانداریە گەرم و گورە ساز بدات ...؟

ئەو زۆر بەسادەیی و بێ هیچ نیشانەیەکی لەخۆ بایی بوون ووتی: زۆر ئاسانەو ئەمانەم لەڕوی ئەرمە بڕییەوە ئەنجامداوون پێشهاتنی ئێوە مریشکەکانم سوورکردبۆوە بەئاگرێکی کزو کەمەوە جێم هێشتبوون چێشتی شلەکەیش لۆبیای زەردکراوی نێو بەستەرە ئەوانی تریش هەمانشێوە کارێکی ئەوتۆشم نەکردووە، کەچی هێندێك پێیان وایە بۆ میوانداری کردنی چەند کەسێك ئەبێ خواردنی ئەشازە نامۆو چەندین کاتژمێر کات بەفیرۆدان و خۆ شپرزەکردن تا میوانەکان دێن هێندە سەرقاڵە توانای خێرهاتنی نییەو وا خۆی لێ هەلکردووە ئەڵێی خانم کەشتیوانی دەریاییەو تازە بەخێرێ گەڕاوەتەوە...!

چەند ساڵێك لەمەو بەرلەگەڵ مێردەکەمدا لەئەوروپا بووین، یەکێك لە پرۆفیسۆرەکانی زانکۆی ئەوێ کەتازە ئاشنای ببووین بانگهێشتی کردین بۆ ئێوارە خوانێك،کاتێ ئێوارە پێشوازی لێکردین پێم سەیر بووکەچۆن ژنەکەی لەوێ نییە، پاش کەمێك پێی وتین خانم لەچێشتخانەیە سەرپەرشتی خزمەتگوزارو خواردەمەنیەکان ئەکات تۆزێکی دیکە دێتە لاتان، کاتێ خانم وەژوورکەوت لەڕوخساریدا ئەبینرا هۆش و بیری لای چێشتخانەکەیە چەند ساتێك دانیشت و دیسان لەچاو وون بۆوە، خواردنەکە زۆر بەتام بوو لەهەموو تەمەنمدا ئەمدیوە هیچ کەسێك هێندە بەتان وپۆی خواردندا ڕۆبچێت بیرو هۆشی هێندە ماندوو بکات لەدوای هێنانی هەرخواردنێك جارێکی دیکە ئەگەڕایەوە بۆچێشتخانەو یەکێکی دیکەی چاو دێری ئەکرد، من هێندە بێزار بووم خۆزگەم ئەخواست لە

ریستۆرانێكی بازاڕدا خواردنێكیان دەرخوارد بداینایە تا هیچ نەبێت بمتوانیبا لەگەڵ خانمدا دەمەتەقێیەك بكەم ، نە لەوە ئەچو ڕێگەی نەرمبڕی نەزانیبێت، چونكە بەلای زۆربەری زۆری ئەوروپیەكانەوە لادان لەنەریتی باوو باپیرانیان گەلێك سەختە .

بەپێی لێكۆڵینەوەكان دەركەوتووە كەم سەلیقەیی و ناهۆشیاری ژن لەماڵداریدا بەناتەواویەك هەژماردەكرێت.

## ٣٠.....سێ ڕێگەی خۆش ویستنی پیاو

سوک سەیرکردن و بەهیچ زانینی پیاو مانای گەورەیی و خۆشەویستی ژن نییە، ژنانی زرنگ لەهەوڵی ئەوەدان بەقورس ڕاگرتنی پیاوەکانیان پێگە کۆمەڵایەتیەکەیان قایمتر بکەن، لەحاڵێکدا گەر ژن لەهەوڵی بەسوک نواندنی مێردەکەی بێت ئەوا ئەوا ئەکەوێتە بەر ڕەحمەتی ئەو پرسیارەی دیارە ئەم ژنە خۆیشی بێبایەخەو سوکە وا ژیان لەگەڵ کەسێکی تاوا سوک و نەشیاودا بەسەر ئەبات.

"پی.تی"خۆی بەگەورەی جادوبازان ئەزانی تەنها لەڕێگەی تەردەستی و جادوگەرییەوە بژێوی گوزەرانی بەدەست ئەهێنا، جارێکیان بەناوی ئەوەی کۆمەڵێک خەڵك ساویلکە فریو بدات لەدەوری خۆی خڕ کردنەوە گوایە پشیلەیەکی گێلاسی ڕەنگیان نیشت ئەدات، کاتێ نمایش دەستی پێکرد پشیلەیەکی ڕشی نیشاندان پاشان ڕونی کردەوە ئەم پشیلەیە ڕەش نییە بێگومان ئەزانن پشیلەی گیلاس ڕەنگی ڕەشیش هەیە ...!

ژن نزیکترین هاوڕێی ژیانی پیاوە ، ڕەونەقو کامەرانی لەدەستی ئەودایە، ئێمە ئەتوانین بەبەکار هێنانی ئەم سێ ڕێگەیە مێردەکانمان بکەینە جێگەی خۆشەویستی خەڵکی :

چەند ساڵێك لەمەوبەرشەوێك لەگەڵ مێردەکەمدا ڕۆیشتین تا "جیناتری" گۆرانی بێژی بەناوبانگ لەودیوی پەردەوە ببینین، بڕیاربوو لەکاتی پشوی نێوان نمایشەکاندا لەگەڵ ئەودا نانی ئێوارێ بخۆین ، من ویستم لەگەڵیدا بچمە دەرەوەی هۆڵەکە بەڵام شاڵاوی خەڵکەکە بەریان پێگرتین، داوای واژۆی

ئەویان ئەکرد، لەبەر ئەوەی ئەو کاتی درەنگ بوو ئەبوایە دوای نانخواردن دوبارە ئامادەی نمایش کردنەکە ببوایەتەوە کەچی سەرباری ئەوە لەگەڵ منداڵاندا خۆش رویی و هەواڵپرسی ئەکرد خۆشەویستی زیاتری پێنەبەخشین دەفتەری یاداشتەکانیانی یەکەیەکە واژۆکرد، من وامزانی ئەو بەمدواکەتنەی بێزار ئەبێت سەرنجێکمدا، کەچی دەسبەجێ لەمەبەستەکەم تێگەیشت بەخەندەیەکەوەچرپاندی بەگوێمداو ووتی: چین هێندە میهرەبانە ناتوانێ وەڵامی نا بەهیچ کەس بداتەوە بەتایبەت منداڵان.. لەهەر ئەو بۆچونە سادەو ساکارەی ئەو لەناساندنی کەسێتی مێردەکەیدا رەنگی دابویەوە لەو هەموو باسە پیا هەڵدانانەی گۆڤارو رۆژنامەکان کاریگەرتر بوو، ئایا مەیل و ئارەزوی ژنێك ئەتوانێ خۆشویستنی پیاوێکی وشك و زبر بخاتە بۆتەی ناسینی لای کۆمەڵێك ...؟ بەڵێ..

من ژنێك ئەناسم مێردەکەی هەرگیز هاوسەنگیەکی کۆمەڵایەتی نییەو لەسای هەست و سۆزی جوان و ناسکی ژنەکەیەوە لەهەموو بۆنەیەکدا جێگەیەکی دیاریکراوی هەیە، ئەو مێردێکی خۆبەزلزان و بایی و خۆپەسەندو زۆر بڵێ وبێ حەوسەڵەیە، کاتێ ژنەکەی بەسەرهاتی دەردەسەری منداڵی ئەوی بۆ گێرامەوەهەستی ئەفریناوی من بەرەو دڵسۆزی و میهرەبانی گۆڕا ، ئەو بەمنداڵی هەتیو بووە هیچ کەس نەیگرتۆتە خۆی و ئامادەی پەروەردەکردنی نەبوون هەمیشە ئەمدەرگاو ئەو دەرگای کردووە ئەکەس ئامێزی خۆشەویستی بۆ واڵاکردووەنەکەسیش بواری خۆ ناساندنی پێ رەوا بینیوە ، هەمیشە هەر جێی ئەفرەتی گشت لایەك بووە ، کاتێ لەبەسەرهاتەکەی تێگەیشتم هۆی توند رەفتارییەکانیم زانی گەر ژنەکەی ئەیتوانیبا ئەو بەکەسێکی خۆشەویست بناسێنێت یا هیچ نەبێ هەستی دڵسۆزی و بەزەیی لەمندا بۆدروست کرد کە چاو پۆشی لەعەیبەکانی بکەم و بیانکەم بەژێر لێوەوە...!

هەرکاتێ پلەو پایەی مێرد گرنگترو بەکارو پیشەی سەنگین ترەوە خەریك بێت بەهەمانرێژە پێویستی بەژنێکەکەبەکەسێکی مرڤدۆستی بناسێنێ، ژنێك بەچاوێکی شیاوو خۆشەویستییەوە مێردەکەی بناسێنێت لەشکست و ناکامییەکانیدا دەست لەکارو پیشەکانی خۆی بکێشێتەوە ئەوجا هاوکاران و کەسانی لەخۆی زیاترو بەرزتر تێنەگەن لەوەی ، گەر ئەم پیاوە کەسێکی شیاوو شایانی ئەوە نەبێت هەرگیز مایەی ئەم هەموو خۆشەویستی و ڕێزەی ژنەکەی نابێت .

**دووەم:**

ئێمە نەبێت هونەرە خەسڵەتە تایبەتییکانی مێرد لەنمایشگادا دابنێین، هەندێك ژن وانەزانن نیشاندانی هونەرەکانی مێردەکەی وەك جل و پۆشاکە گرانبەهاکانی خۆیان وایە بیکێشن بەڕوی خەلکیدا ، بەڵام ژنانی زرنگ چاکتر شارەزان هونەرو خەسڵەتە تایبەتییەکانی پیاو بەخەڵکی بناسێنن .

لەپەناوە ژنێکی گەنج پێی ووتم: بۆڕاکێشانی سەرنجی هاوڕیکانی مێردەکەی ئەیەوێ فێری داستانی دەمەتەقێ و شۆخی نامێز بێت تا بتوانێ مێردەکەی بکاتە جێی تێڕامانی ئەوان ، من ماوەیەکی زۆر خەریك بووم لەگەڵیدا, هیچ دیەنێك لەوە زیندوو تر نییە ژنێك لەدانیشتنی میوانی و لەبەرامبەر کۆڕیکدا سەرنج بەلای خۆیدا کێش بکات، ئاسانترین ڕیگەی کامەرانی دڵخۆشکردنی پیاو ئەوەیە ژنەکە لەو میوانداریيانەی ڕیکیان ئەخات کەش و هەوایەکی وای بۆ بسازێنێ تاکو پیاو هونەری حەزەکانی بەنمایش بگەیەنێ .

**سێیەم:**

ئەتوانن بەدروستکردنی باسێك دانیشتنەکە خۆشتر بکەن، جاری وا هەیە لەدانیشتندا پیاو خامۆش و بێدەنگە ناتوانێ تەنها وشەیەك بدرکێنێ نازانێ چ جۆرە باسێك بدۆزێتەوە لێرەدا ژنێکی لێزان چاکترین یاریدە دەری ڕاستەقینەیەتی ئەتوانێ کۆمەڵێك ڕوداو بێنێتەوە یادی کەبە هیچ جۆرێ هەستی بێزاربوون نەکات.

هاوڕێیەکم ووتی:مێردەکەم هێندە کەم دووە لەئاستی ئەدیوو ئەناسدا شەرم ئەکات ئەمەش وایکردووە بەچاوێکی دیکە تەماشا بکرێت ، گەر ئەوانەشم بەڕویدا بکێشایەتەوە بێگومان ئەنجامەکەی بێزار بوون بوو، هەر بۆیە ڕێگەیەکم هەڵبژاردنەووم لەو بارودۆخە دەرهێنا، زۆر حەزی لەوێنە کێشان و تابلۆ سازی بوو، بۆیە بۆ هەشوێنێك بچوینایە کەسێکم ئەدۆزییەوە وەکخۆی هەمان ئارەزوی هەبێت،منیش هەردوکیانم بەیەکتر ئەناساندنەمەش بەجۆرێك ئەبویە ڕۆچون و نوقم بوونی بەتەواوی خۆی لەبیر ئەچویەوەو کەسێتیە ڕاستەقینەکەی خۆی ئەخستە ڕوو هێندی هێدی ئاشنا بوون و تێکەڵاو بوون وایکرد کۆسپەکانی دیکەی لەبەردەمدا ڕەواندەوە.

## گەورەیی بەخشایش و بێنرخی شورەیی

وارسکاوه پیاوان لەدەربرینی بەخشایشەکانیا قەڵس و بێزارن، کەچی بەلای ژنانەوە ئاساییە لەبارەی مێردەکانیانەوە بدوێن، ئەزموون سەلماندویەتی پێناسەو پیاهەڵدانی لۆژیکیانەی ژن سەبارەت بەخشایش و خەسڵەتەکانی مێردەکەی باشترین پەیام و گەیەنەرە، کاتێ پزیشکێك تیماری نەخۆشێك ئەکات ژنەکەی سەبارەت بەو بەخشایشەی ئەو دەبێتە گەیەنەرێك ئیدی کابرا دەبێتە کەسێکی خۆشەویستی بیسەران و بەهەمان چاوی ئەوەوە تەماشای ئەکرێت، ڕاستیش لەوەدایە بیرۆکەی ژنێکی زرنگ لەکارو باری پیاوەکەیدا ئەنجامێکی هێندە کاریگەری هەیەهیچ بلاو کراوەو ڕاگەیاندێك نیەتی .

خاتو" دورروتی دیك"پسپۆڕی بواری هاوسەرداری ئەڵێت : ئەوەی وامان لێئەکات کە فلان کەس بەکەسێکی شکۆدارو گرنگی بزانین یان بڕوای تەواومان بەفلانە پزیشك هەیە ئەوەیە ژنەکانیان پێناسەیەکی لەوجۆرەیان بۆکردوین.

مرۆڤ هەمیشە ئامەزرۆی ئەوەیە ئەوبەخشایش و خەسڵەتانەی ئەدرێنە پاڵی لەخۆیدا بینوێنێ، وەك چۆن بەمنداڵێك بڵێین : منداڵێکی لاسارو بزێوەئەویش ڕۆژ بەڕۆژ پێی لێدرێژ ئەکات، بەڵام گەربەگوێڕایەڵ و ڕەفتار جوان ستایش بکرێت ئەویش هەوڵی ڕەنگ پێدانەوەی لەخۆیدا ئەدات.

لەکۆنفراسێکی دادگایدا سەرۆکی مەڵبەندی بریکاران لەمیانەی وتارێکدا بۆ ئەندامانی ڕونکردەوە ووتی: هەرگیز کۆمەك و هاوکاری ژن لەپێشڕەوی کارەکانتاندا بەچاوێکی سوك مەبینن، هەمیشە وتەو ڕەفتاریان

بکەنە جێی سەرنج، چونکە ئەو ئەتوانێ گەورەترین و بکارترین ڕێژەی کارو پیشەتان بێت، ئێوە ئەوتوانای دەربڕین وستایش و پیا هەڵدانانەتان نییە هێندەی ئەوان لەوبوارەدا پسپۆڕن، ئەو ئەتوانێ بەستایش و چاکناساندنی مێردەکەی بەکەسێکی شیاوولێهاتوو بەهەموو دنیا هاوشان خاڵە لاوازو بچوکەکانی بۆ بشارێتەوە ، چونکە کەسمان لە عەیب و ناتەواوی بەدور نین تەنانەت ناودارو گەورە كانی جیهانیش بێ کەم و کورتی نەبوون، بۆنمونە:

(بتهۆڤن)ژەنیارو ناهەنگسازی بەناوبانگی جیهانی و خاوەنی شاکارە مەزنەکان هەردوگوێچکەی کەڕبوون ...!

(بایرون)شاعیری شکۆداری ئینگلیزی هەردو قاچی شەل بوون...!

(ناپلیۆن)نەیئەتوانی لەبەردەمی خەڵکیدا قسەیەك بكات، گرفت لێرەدایە کە عەیب و ناتەواوی پیاو ڕێگرە لەپێشڕەوی کارو پیشەکەیدا ئەمە لەحاڵێکدا کە ناتەواوی ژن تەنها لەکارو باری ماڵداری و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا دەر ئەکەوێت، گەر ژن بیەوێت توانای پڕکردنەوەی کەلێن و کەم و کورتییەکانی مێردەکەی هەیەو ئەتوانێ بیگەیەنێتە ترۆپکی کامەرانی، زۆرینەی پیاوە ناودارە سەرکەوتووەکان جەوهەری سەلماندنی بونیان وەك ئەڵماسی خاو لەدڵی بەددا شارابونەوەلەسای هەبونی ژنی دانشمەندو چاپوکەوە ڕێگەی ترۆقی وشۆرەتی مێردەکانیان ولاکردووە، نمونەش (انریو جانسون) یەکێك بووە لەسەرۆکە ناودارو بەتواناکانی ئەمریکا، ئەکاتێ کەژنی هێنا هیچ جۆرە خوێنەوارییەکی نەبور، بەڵام ژنی لێوەشاوەفێری خوێندنەوەو نوسینی کرد گەیاندیە پلەیەك كەم كەس توانای پێگەیشتنی ئەو جۆرە پلەیەیی هەیە.

ئێوەش بەبەکارهێنانی ئەم سێ ڕێسایە ئەتوانن دەسبەکاربن :

☜ **یەکەم :**

هەمیشە کارە گرنگ و دیارەکانی لەڕابردودا دەسبەکارو سەرکەوتووبوە تێیدا بەیادی بێنەرەوە.

☜ **دووەم :**

هاندەریبە لەکۆڕوکۆمەڵ و میوانداریەکاندا بەوریایی و لەسەر خۆ وەڵامبداتەوە .

☜ **سێیەم :**

لەبارەی هونەرو حەزو دەسترِنگینیەکانیەوەبدوێ تا بێتە جێگەی ڕێزو بەچاوی خۆشەویستیوە تەماشا بکرێت

## ٣٢.... گوزەران بەدەرامەتی پیاو

دارِشتنی بەرنامەی خێزانی لەسەر بناغەی دەرامەتی پیاو بابەتێکە نەبێت بەدیقەت و کارزانی تەواوی ژنی ماڵەوە بەڕێوە بچێت، کاتێک تەماشای نمایشێك ئەکەین دەبینین ژنانی قەشەنگ و گرانپۆش بەهیچ جۆرێ لەگەڵ مێردەکەیدا ناگونجێت هەروەك منداڵ بیانوو ئەگرن و ئەڵێن : من ئەمەو ئەوە نازانم هەرنەبێت فلانە شتی گرانبەهام بۆ بکڕیت ...!

نوسەرانو ڕەخنگرانی کۆمەڵگا هێندە بابەت و شانۆگەرییان لەبارەی هەڵە خەرجیەوە نوسیوە لەڕادە بەدەرن هەریەکێکیش لەئێمە بێگومان ئەو بابەتانەی خوێندۆتەوەلەوانەشە زۆربەمان گاڵتەمان پێی هاتبێت، ئە کۆمەڵناسانەی ناتەواویەکانی کۆمەڵ بەچاوی ڕاستەقینە بەر جەستە ئەکەن، بەڵام باناگاشمان لەوەبێت لەژیاندا هیچ کارەسات و کێشەیەك هێندەی کارو باری دارایی ئاڵۆز نییە، ئەو پیاوەی زیاتر لەبودجەی خۆی خەرج ئەکات واتە (پێی لەبەڕەی خۆی درێژترە)ئەوە کەسێکی دەست و دڵ باش نییە، بەڵکو پایەو بناغەی بەچۆکدا هاتنی خۆی بتەو تر ئەکات یا ئەو ژنە دەسبلاوە بێ مێشکەی وەك منداڵ بیانو ئەدۆزێتەوە بەرۆکی پیاوی پێ ئەگرێت وەك زەرو ئەنوسێت بەپۆشاك و شتی گرانبەهاوە هێندە گونجاو نییەو وەك بەرداشێك خراوەتە ملی پیاوگەردنی وردو خاش ئەکات، ئەمڕۆش نرخی کاڵاکان هێندە بەرزن کە بژێوی ژیان فریایان ناکەوێت، گەرچی پێمان وابێت تا دەرامەتی زیاتر لەبن هەنگڵماندا بێت تەواوی خەم و پەژارەو دارییە ئابورییەکان ئیدی چارە ئەکرێن ئەمەش بیروکەیەکی

(سەفسەتە) ئامێزو بێمانایەبەجۆرێ کە ئابوریناسان ئەڵێن :دەرامەتی زیاتر چارەی دەردەکان ناکات .

"السی استا پلتون"ئابوریناس و ڕاوێژکاری مامەڵە بازرگانیەکان ئەڵێت: ئەوانەی دەرامەت و پارەو بودجەیان زیاد ئەبێت بێگومان خەرجیشیان زیاتر، سەرەنجام بێپارەیی و دەسکورتی بەرۆکیان پێئەگرێت .

لە"مونترال-بانك- کندا"پۆلێك دامەزرێنراوە تا ڕیگە چارەی خەرج کردن فێری کڕیاران بکات کاتێ دەرامەتیان لەهەڵاوساندایە .

ئەوکاتەی خەریکی نوسینی ئەم کتێبە بووم لەبەدوادا چونەکانمدا چاوم کەوت بەکتێبێك نوسەرەکەی دەروونناسێکی ناودارە لەبواری پەیوەندییە خێزانیەکاندا، بەتەواوی داخەوە ئەبێت بڵێم نوسەر لاوازی و ناتەواناییەکی سەیری خۆی نواندووە کەدیاریکردنی بودجەی بەکارێکی ناپێویست و بێبایەخ لەقەڵەمداوە هەر لەبەر ئەوەشە لەناوبردنەکەی پارێز ئەکەم، ئەوبەڕێزە ئەڵێت:خەرجکردن و ڕابەری پارەو پولو دەرامەتی خانەوادە کارێکی گەلێك ئاسانە ...! هەرکاتێ پارەم لەدەستدا بوو خەرجی ئەکەم، هەرکاتێکیش نەبوو ئەوا هەرچی چۆنێك بێت ئەیدەمەبەر ...!"

منیش ئەدەمە پاڵی بیرو بۆچونەکەی نوسەر گەلێك سادەو ساکارە، بەڵام ڕێگەی ڕاستەقینەی خەرجکردن ڕێکخستنی بودجە بەوجۆرە نییە.

کەئەو دەقەی سەروە شەن و کەو ئەکەین دەسبەجێ ژیانی قەلەندەران و دەروێشان دەبنە تابلۆوخۆیان نمایش ئەکەن کەبەڕەمەکی و لامسەلایی (یاحق) بێژان هەرچیەکیان چنگ بکەوێت هەرهەمانرۆژ هەڵئەقوتی ئەکەنو ڕۆژانی دوایش بەرۆژوو ئەبن هەمیشە نیازمەندن ...!

پێویستە دەستڕەنجتان لەدەست نەچێت بەهۆی هەڵە خەرجیەوە پێویستە خۆتـان و ئەندامانی خێزان هەریەك پشکێکی عادیلانە لەدەرامەتەکەی پاشەکەوت بکات، ڕێکخستن نەك ئەوەی خۆت لەهەموو شتێك بگریتەوە و پولبەپول کورد وتەنی:مشکی کوێر............

پلانی بودجە پێکهاتووە لەنەخشەیەکی دیاریکراوو بەرنامەیەکی ئەندازەیی تا ببێتە یاریدەدەرێك لەدەسکەوتەکان سود مەند بن،ژنێك لەڕێی بەرنامەو نەخشەوە کارو باری‌ماڵداری و خەرجی لە ئەستۆ بگرێت ئەوا گەورەترین و گرنگترین کۆمەك و خزمەتی لەپێناو سەرکەوتنی مێردەکەیدا خستۆتە گەر ئەوپیاوانەی گرفتاری دەستی ژنی دەسبڵاوو هەڵە خەرجن هەرگیز چاویان بەناوچاوی سەرکەوتن ناکەوێت ،گەر مێردەکەتان ڕێگەی پارە پەیدا کردن شارەزایە بەڵام بیرلەپاشەڕۆژ ناکاتەوە ئێوە پێویستە بەوریاییەوەجڵەوگیری لێبکەن ئەگەریش زۆر دەست نوقاوەو چروکی ئەکات ئەوا بڕوایەکی پێ ببخشە کەتۆیش بەهەمان دڵسۆزیەکەی ئەوەوەهەستی لێپرساویت هەیە بەرامبەر بەخەرجکردن...

لێرەدا چەند پێشنیارێکت بۆ دا ئەنێم لەبارەی بودجەوە :

## یەکەم :

شێوەیەکی وردبینانە لەپێویستییەکانت ئامادەبکە تاببینی چۆنەو بەکوێ ئەگات، وەك چۆن پزیشك تانەخۆشیەکە نەدۆزێتەوە توانای چارە سەرکردنی نییە، هەمانشێوە ئێمەش تاکەم و کورتیەکانمان نەدۆزینەوە توانای چاکسازیمان نییە، دەسگرتنەوە ئەوە نییە بەبێ کێش و پێو پێویستییەکان

فەرامۆش بكرێن، كاتێ تێكستی تەواوی پێویستیەكانمان لەبەردەستدا بێت بەسەرنجدانی نەتوانین بزانین كامیان پێویستەو كامیان پێویسترە .

**دووەم:**

بەپێی پێویستیە خێزانیەكان خشتەی خەرجی ساڵانە ڕێك بخە، خەرجیەكی دیاریكراو بۆ پێویستیە نەگۆڕەكان وەك كرێی خانوو خەرجی خۆراك بژاردنەوەی قەرز و نەخۆشخانەو داوو دەرمان جل و پۆشاك و خەرجی خوێندن هەڵە خەرجییان لەپاڵدا مەكە .

**سێیەم:**

لەدەرامەتی ساڵانە ١٠٪ پاشەكەوت بكە، ئابوری ناسان ئەڵێن گەر بتوانیت ١٠٪ لەدەرامەتی پیاو پاشەكەوت بكەین پاش چەند ساڵێك ژیان ئاسودە تر دەبێتو چەندیش باری گوزەران بەرەو هەڵاوسان بچێت كاریگەریەكی ئەوتۆی نابێت .

هاوڕێیەكم وتی: لەسەردەمی قەیرانی ئابوریدا كە سەرانسەری ئەمریكای گرتبۆوە موچەی مێردەكەی بەرەو نیوەو زیاتریش دابەزیبوو، ناچار بوون بەڕێگەی جۆراو جۆر باری ژیانیان بەڕێوەببەن تاكو خەرجیەكانیان لەسنوری دەرامەتەكەیان دەرنەچێت وەك لەبری خەرجكردنی كرێی هاتوچۆ زۆربەی جار ڕێگاكانیان بەپیادەیی ئەبڕی بۆ كڕینی خۆراكو پێداویستیەكانی دیكەش چەندەها كاتژمێریان بۆ مامەڵەكردنەكەی بەخەرج ئەدا، وێڕای ئەمانەش هیچكاتێ ئامادە نەبوون دەسبەرداری پاشەكەوتی ١٠٪ دەرامەتەكەیان بن ، خانم بەتەواوی كامەرانیەوە وتی:

بەوەی زۆرپێویستمان بەپارە بوو چەندین جار ئەهاتمە سەر ئەو بڕوایەی دەسبەرداری ١٠٪ی پاشەکەوتکردنەکەمان بین، بەڵام ئەمڕۆ شادمانم ئەوەم نەکرد بۆیە لەسای سێبەریدا خاوەنی ماڵ و دارییەکی چاك و بەختەوەرین .

**چوارەم :**

پاشەکەت کردن بۆ تەنگانەو کارەساتی چاوەڕوان نەکراو، ئابوری ناسان ڕێنامی تازە هاوسەران ئەکەن کە هەرسێ مانگ جارێك کرێی مانگێك بۆ کارەساتی شوم و چاوەڕوان نەکراو دابنێن بەواتا هەرساڵەی چوارمانگی بەردەکەوێت ، مەرجیش نیە پڕاو پڕ هەمو مانگەکە دابنرێت ئەتوانیت دابەشی سەر هەفتەکانی بکەیت و بەردەوام بیت.

## قۆرخ کردنی ژیانی پیاو

لەو باوەڕەدا نیم کەس بتوانێ ژیانی خۆی لەپێناوی پارەدا بەخت بکات، گەروابێت بێگومانم لەوەی هیچ سەروەت و سامانێك بتوانێت بەرگری لەگیان لەدەست چوون بکات.

خوشکی بەڕێز : ژیانی پیاوت لەدەستدایە...! ئەتەوێ بزانیت چۆن مێردەکەت تەواو ئەکەیت و لەدەستی دەرباز ئەبیت...؟ بۆ ئەم مەبەستەش پەنا نابەمە بەر هیچ چەمك و مەفهومێك...! بەڵکو خواردەمەنی چەورو نیشاستەدارەکان و شیرینی و کێکی دەرخوارد بدە تا هیچ نەبێت ١٥-٢٠٪ لەکێشە ئاساییەکەی خۆی زیاتر بێت ئەوکات خاتر جەم بەو بیریش لە ساتو وەختی بێوەژن بونت بکەرەوە، لەسەر لێکۆڵینەوەی پسپۆڕان ٧٠-٨٠٪ پیاوان زیاتر لەژنان لەتەمەنی ٥٠ ساڵیدا ئەمرن و تاوانەکەیشی ئەکەنە ئەستۆی ژنان و سەرزەنشتیان ئەکەن .

بیرۆکەی دکتۆر "لویس.ای. دوبلین"پزیشکی کۆمپانیایەکی بیمە گوزاریە لەراپۆرتێکدا لەژێر ناونیشانی (دەسبەرداری پیاو کوشتن بن)هاوشان لەگۆڤاری "لایف تایم لوینیگ"ئەڵێت:

ئەنجامی ئەزمونی چل ساڵ لەکۆمپانیایەکی بیمەگوزاریدا گەشتمە ئەو ئاکامەی زۆربەی پیاوانێك بەرلەکاتی مردنیان جوانەمەرگ ئەبن، گەر ژنەکانیان هەستی بەرپرسێتی خۆیانیان بزانیبایە دیارە بەوردی هەولی خۆیانیان لەگەڵدا ئەخستنە گەرو بێگومان لەمردن ڕزگاری ئەکرد، ئەو توێژینەوەیەکی وردی لەسەر ئەو کەسانە کردووە کە مەرگی ٨٠٪ پیاوان لەئەنجامی قەڵەو بون و زیادی کێشەوەیە.

كەواتە گەر مێردەكەت كێشی لەكێشی ئاسایی زیاترە دیارە چارەنوسی وەك تەمەنی گوڵە نێرگز وایە، ورگنی و قەڵەوی یەكێكە لەو مەترسیانەی تەندروستی هەموو كەسێك ئەخاتە مەترسیەوە، ناشتوانین نكوڵی لەوە بكەین هەرخۆراكێكی بەچێژ ژن بیخاتە بەردەمی پیاو چەندە بەنایابی و سەلیقەوە دروستكرابێت هێندەش كاردانەوەی لەسەر ورگزلی پیاو هەیە تەنانەت باوە گەورەمان حەزرەتی ئادەم لەبەهەشتدا تاوانی گەنم خواردنەكەی دەكاتە ئەستۆی دایەگەورەمان (حەوا) و ئەڵێت : ئەو هانیدام تاكو لێی بخۆم...!

پیاوانیش كە دەچنە ساڵەوە چونكە چالاكی لەشیان كەمترە كەمتریش لەشیان پێویستی بەخۆراكە، كەچی بەپێچەوانەوە زیاتر ئەخۆن، گەرئێمەش ئارەزو بكەین تەمەندرێژو لەش ساغ بن ئەوا خشتەی رژێمە خۆاكیەكان دەستەبەر دەكەین .

دكتور "روبیرت"سەرۆكی نەخۆشخانە دەرونیەكان وشیارمان ئەكاتەوەوئەڵێت: ئەو پیاوانەی لەدنیای دەردەسەری و جەنجاڵیدا ئەژین، ژەمە ناخواردنی بەپەلەی بەیانیان بۆ فریا كەوتنی سەركارو قاوەڵتی دوبارەی چێشتەنگاو گەلێك دژوارو مەترسیدارە.

كەواتە خانمی بەرێز هەوڵبدە و بەیانیان كەمێك زوتر بێداربەوە نانێكی ئاسودەو لەسەرخۆی بۆ ئامادە بكە مەهێڵە توشی تێك چونی كۆئەندامی هەرس و ترشەڵۆكی گەدە ببێت ...

گەر خوازیاری مێردەكەت لەنازو نیعمەتی لەش ساغی و تەمەن درێژی بێبەش نەبێت پەیرەوی ئەم چەند رێسایە بكە :

☜ **یەکەم :**

هێندەی پارێزگاری و چاودێری لەکێشی خۆت دەکەیت مێردەکەیشت بەهەمانشێوە، هەرگیز داوو دەرمانی لاوازی و قەڵەو بوون بەبێ چاودێری پزیشك بەکارمەهێنە، کەپزیشك رژێمەکانی خۆراکیت بۆ ڕێك ئەخات بەسەلیقەی تەواوەوە پەیڕەوی لەڕێنماییەکانی بکە

☜ **دووەم :**

هەموو ساڵێك بیری بخەرەوە تاکو پشکنینی هەموو ئەندامەکان و ددانەکان و چاوەکانی بکات دیارە ڕێگە چارەی بەرگری کردن لەنەخۆشی خۆپاراستنە .

☜ **سێیەم :**

مەهێلە لەسنوری توانای خۆی زیاتر برەنجێت و کار بکات، دورنیە زیادەکاری بێتە مایەی پلە بەرزی، بەڵام گەرزیان بەچالاکی و تەندروستی بگەیەنێ قازانج سەری مایە دەخوات و بێگومان هیچ سەروەت و سامانێکیش قەرەبووی گیان لەدەست چوون ناکاتەوە .

☜ **چوارەم :**

باوەك پێویست پشوو بدات، باشترین ململانێی ماندوو بون تەنها پشودانە، گەرنان لەماڵەوە ئەخوات ئەوجا ئەگەڕێتەوە سەرکارەکەی، هەوڵبدە با ١٠-١٥ خولەکێك وچانی لەسەر بگرێت، گەر بە شەکەتی ئەگەڕێتەوە هەوڵی دروستکردنی کەشێکی ئاسودەو بێ چرپەی بۆ بسازێنەبا هیچ نەبێت چارەکە

خولەکێك بەرلە نانخواردن بخەویت هەر ئەو ماوەکورتە پشووە دەبێتە هۆی زیاتر بەرگە گرتن و تەمەندرێژی.

"سامرست موام" چیرۆکنوسی ناوداری ئینگلیزی زیاتر لەهەشتا ساڵ تەمەنی بوو زۆر بەگوڕو تینەوە کارەکانی ئەنجامئەداو هەموڕۆژێك ١٥ خولەك دوای نانخواردن ئەنوست نهێنی ئەو ژیانەی بەسەری بردقەرزاری ئەو ١٥ خولەك پشووە بوو....!

"وینستون چرچیل" ی نوسەرو سیاسەتمەداری بەتوانا هەموو ڕۆژێك دوای نانخواردن یەك تادوو کاتژمێر ئەنووست .....!

"جولیان دوتمر" ٩٠ ساڵی ڕەبەق ژیاو بەردەوام سەرگەرمی باخچەو گوڵو درەخت بوو، بەردەوام چەند کاتژمێرێکی دوا نیوەڕوان ئەنوست و ئەیوت: ئەو خەوەی دوا نیوەڕوان وەك ئامێری مۆسیقا سەرلەنوێ ئەمخاتەوە جۆش ...!

## ☜ پێنجەم :

ماڵی بۆ بکەرە لانەیەکی ئاسوودەی پشوو، ژنی بۆڵەبۆڵ کەرهەمیشە سکاڵاو گلەیی لەدەست مێردەکەی ئەکات گەورترین لەمپەری پێشڕەوی کارو پیشەی پیاوە لەهەموشی بەدتر ڕوگرژییە هەڕەشەی زیاتر لەتەندروستی ولەش ساغی پیاو ئەکات .

"هاری گولد" پرۆفیسۆری زانکۆی "کرنل" ئەڵێت پیاوە بەدبەختەکان زیاتر لەئاستی ناساییان ئەخۆن و ئەخۆنەوە ، ڕونتر...خەڵکی بۆ دەربازبوون لەدەست تورەیی و گرژو مۆنی وکاتە تاڵەکان زۆر جار پەنا ئەبەنە بەر خواردنەوە.

## ٣٤....بەرزکردنەوەی ئاستی خۆشەویستی

"اتیل".اج.ویس"بریکاری ڕیکخراوی کۆمەڵەی نەوجەوانانی نیویۆرك و پسپۆڕی زانستە کۆمەڵایەتیەکان وپەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان ڕونی کردەوەدەڵێت: یەکێك لەدەردە کوشندەکانی تاوانکاری سەبارەت بە جەردەیی لەنێوان نەوجەوانانندا هۆی بێبەش بونیانە لە ئەوینداری و خۆشەویستی ، ئەوانەی لە سۆزو خۆشەویستی باوك و دایك و کۆمەڵگا بێبەشن دێن و تۆڵەی خۆیان لەدزی و جەردەیی و ڕێگری و تاوانکاری و کارە نەشیاوە جۆراو جۆرەکاندا ئەکەنەوە، کاتێ لەگەڵ مێردەکەمدا وانەمان بەدەستەی نەوجەوانانی زیندانی ئەووتەوە تاکو ئاستی ڕەوشت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان فێربن، ئەولاوە بەدبەخت و نائومێدانە دەستیان لەگیانی خۆیان شۆردبوو، بەدبەختی چارە شوومیان لەکەمتەرخەمی و نامیهرەبانییەوە سەرچاوەی گرتبوو، یەکێکیان پێی ووتم:دایکی هەرگیز وەڵامی نامەکانی ناداتەوە، تا بەگوێی خواست و ئارەزوەکانی ئەو بکات، هەرچەند ئەو خەریکی خوێندن و پەروەردەی کەسێتی خۆیەتی تاداهاتوویەکی ئومێد بەخش و ئابڕو مەندانەی بۆدروست ببێت، کەچی دایکی لەوەڵامێکیدا بۆی نوسیبوو، خەیاڵی ئەوەنەکات تازە هیچ شتێك کەڵکی حاڵی ئەو بگرێت و بتوانێ گۆڕانی دەرونی و ڕەوشتی لەخۆیدا بەدی بێنێت چونکە ئەو هەمیشە هەربە ڕسوایی ئەمێنێتەوە .....!

ئەم وەڵامەش لەلایەن داکێکەوە چەندینساڵ جگەر گۆشەکەی فەرامۆش کردبێت بەدڵنیاییەوە ئەبێت جگەر گۆشەکەی تەنها هەر میوانی زیندان بێت...!

"تومى" لاوێكى ١٩ ساڵانە بوو زیاتر لە دەساڵێك لەو تەمەنە كورتەى لەهەتیوخانەو گرتن و سزاداندا بەسەر بردبوو پێى ووتم: ئەوەى نیازمەندین بۆى ئەوەیە كەسێك شك نابەین تا نازمان بكێشێت تامێزى سۆزو میهرەبانیمان بۆ ولاكات، من هەرگیز لەماوەى تەمەنمدا سۆزو میهرەبانى كەسێكم نەدیوە تاكو تەمەنى ١٦ ساڵیم تەنانەت دەنكە نوقڵێك یا دیاریەكى "كریسمسم " بەدوچاو نەدیوە.

هەربۆیە نابێتە جێى سەرسوڕمان ئەو مێرد منداڵانەى خاوەنى ئەمجۆرە هەستەن بێگومان نازارێكى زۆر ئەچێژن هاوشان ... سەندنەوەوقەرەبوكردنەوەى ئەو بارو دۆخى بێبەشبون لە ... دەروونییە بەتاوانكارى و خراپەكارى ئەچوێنن، وێنەى كەسێكى برسی ... وە گیان كەبێبەشە لەخواردن و خواردنەوەى خۆش و پاك بۆمانەوەى خۆى پەنا ئەباتە بەرگەنددڵی و مشە خۆرى.

كەواتە عەشق و خۆشەویستى خۆراكى دەروونى هەموو مرۆڤێكە، هەبوونى مایەى پەروەرش و بەهێزبونى دەرونە نەبوونى ڕەوشت و توانا سست و زەبوون ئەكات .

"گوردن البرت "ى دەروونناس ئەڵێت:تواناى بەردەوام بوونى ژیان بەبێ عشق و خۆشەویستى كارێكى مەحاڵە، كاریگەرى هێزى عەشق و خۆشەویستى لەپەیوەندى كۆمەڵایەتیدا هەزار بارتەقاى هێزى میكانیزمی و ئەتۆمییە، هەزاران بەسەرهات و ڕووداوى دەسەوسانكەر كەخوێندومانەتەوەو بیستومانە یان بینیومانە هەموى لەساى عەشق و خۆشەویستیەوە بوون واتە ئەوەى ئێوە بەرهەمهێنەرن و ئەیبەخشنە مێردەكانتان گرنگترین فاكتەرى پێشكەتن و سەركەوتنە لەژیاندا .

دکتــۆر "پولپنپــو"ڕێبــەری گشــتی ڕێکخــراوی پەیوەندییــە خێزانییــەکان لەکۆنفرانسێکی ساڵانەی ئەنجومەنی ماڵ و فێرگەدا ڕایگەیاند :

... گــەر ئەنجومــەن لەدانیشــتنەکانی ســاڵانەیدا منــداڵان بــە گشــتی فەرامۆش بکات لەبریتیدا نامۆژگاری ژن و مێردان بکات و فێـری خۆشویســتنی یەکیان بکات بێگومان گەورەترین خزمەتی بەمنداڵان پێشکەشکردووە .

چۆن بتوانین پلەی عەشق و خۆشەویستنی پیاو بەرەو باڵا بەرین ....؟

☜ یەکەم :

هەموو ڕۆژێك چەند وشــەیەکی بزوێنــەر دەربــڕە بــۆ مێردەکــەت، هــیچ کارەساتێك لەوە ناخۆشترو گرانتر نییە کە گرانترین خەڵاتی ژیــان بەچــاوی ســوك سەیر بکەین و لەدەستی دەرکەین ،ماوەیەك لەمەوبەر نامەی ژنێکــی دڵشــکاوو خەمگین کە تەڵاق درابوو گەشتە دەستی مێردەکەم، ئەو لــەناوەڕۆکی نامەکەیــدا نوسیبوی :

مێردەکەم هەرگیز لەوە تێ نەنەگەیشت کەمن چــەندەم خــۆش ئــەوێت و تاج ناستێك پێویستمە ...!

مەخابن مێردەکەی دەرکی تەواوی بەوە نەکردبوو ماوەی ئەو چــەند ســاڵ پێکــەو ژیان ئەبوایە لەناخیدا جێگەی تایبەتی بۆ دابین بکردایە ....! ئایا بەســەر هــاتی ئەم بەدبەختە نا ئاسایی و کەمــە...؟ بێگومــان ...نــەخێر، لێکۆڵینــەوە کــانی دکتور" ترمان "و هاوڕێکانی کەلەسەر ١٥٠٠ ژن و مێرد ئەنجامیان دابوو بۆیان دەرکەوت کە پیاوان لەدوای بۆڵەو پرتەو کەچرەفتاری ژن ، دەرنەبڕینی عەشــق و خۆشەویستی بەمەترسیدارو گیانبێزار ئەزانن و کەمتەرخەمی ژنیش بە هۆکــاری گرنگی ناکامی و تاڵی هاوســەرداری لەقەڵــەم ئــەدەن، زۆرینــەی ژنــان بەکێشــەو قەیرانی ژیان ڕوبەڕو ئەبنەوەو بەو پەڕی فیداکارییەوە سەرفەرازی تێــدا بەدەســت

نەهێنن، بەڵام مەخابن لەگەیاندنی زادو تێشوی عەشق و خۆشەویستی کەوەك نان و ناو پێویستە بۆژیان ،چروكی و رژدی نەنوێنن، نازانن دڵی پیاو وەك هەر مرۆڤێك تامەزرۆیە بۆی، ژنانی نەفام و بیناگابێ میهری وسادەیی ئەبنە هۆی بێكاری و قەرزداری و زیندان ویان مردن و تیچوونی پیاوپاشان دەستەو ئەژنۆ ئەچنە ژێری و بەماتەمینی لەگۆشەیەك ئەخزێن و یادەوەری ئەورۆژانە ئەكەن بۆنەو هەلە زێرینانەی لەدەستیان دەرچووە.

ئایا تائێستا دەركت بەوە كردووە ئێمەی ژنان تەنها لەبەرناسودەیی دەرون و بۆ ئەوەی سەربەخۆو خاوەن ماڵ و منداڵ بین و ئەبینە پیرە كچی قەیرە شوومان كردووە....؟ هاوشان ٩٠٪ی پیاوان لەبەر عەشق و خۆشەویستی ژن نەهێنن ...!

تا ئێستاش زۆربەی ژنان پێیان وایە ئەوان ئەبێ هەر وەك تازە بووك خەمزەو ناز بكەن بەسەر پیاوەكانیاندا ...!

ئەزمون بۆی سەلماندم :

ئەوانەی هەمیشە گلەیی وسكالآیانە لەدەست مێردەكانیان بەزۆری خۆیان كەسانێكی بێ پەیوەندی و كەمتەرخەمن بەرامبەر مێردەكانیان ، ئەوان تەنها ئەستەقبازی و ناتۆرە دەرهێنان ئەزانن وەگەرنا ئەوانی چاوەڕوانی ئەكەن تا مێردەكانیان دەستخۆشی و ستایشی چاكەیان بكات هەمان هەستیش لەبەرامبەریاندا هەیە ئەوانەش لەپێری ئەو ئەخۆشە دەروونیانەن كە دكتور " ویلیم مینجر" لەبارەیانەوە ئەڵێت :

هەندێلا هێندە خۆیانیان خۆش ئەوێت ئیدی عەشق و خۆشەویستیان بۆ كەسانی دیكە پێ نەماوە .

لەدادگای " ئیستیناف"ی ویلایەتی "میریلند" بابەتێكی سەیر سەری هەڵدا ئەویش : ئایا لەرێگەی یاساییەوە ژن مافی ئەوەی هەیە خۆی بگرێتەوە لەقسەكردن لەگەڵ مێردەكەی تا ئەو پیاوە تەواوی ماف یا دەرامەتەكەی بخاتە بەردەستی ژنەكەی ...؟

دادگا ڕایگەیاند : بەهیچ جۆرێك ژن ڕێگەی پێنەدراوەو ناتوانێت بۆ عەشق و خۆشەویستی سەبارەت بەمێردەكەی نرخێك دابنێت .

نەبونی پەیوەندییەكی ئەوتۆی ژن سەبارەت بەپیاو بەدخۆراكییەكی دەرونییە، چونكە بەردەوامی ژیانی ئەو تەنها بەنان و ئاو نییە و دەرونیش هەمانپێویستی تایبەتی عەشق و خۆشەویستی خۆی داوا ئەكات .

**☜ دووەم :**

بتەوو خۆڕاگربە، ژنی خۆڕاگرو بەئارام لەبەرامبەر ئەگونجاوی كەمتەرخەمی پیاوەكەیدا بەتینە هەمیشە پایەو بناغەی خۆشەویستی بتەوتر ئەكات .

"جورج ناتان " ئەڵێت :بە ئەزمون بۆم دەركەوتووە عەشق و خۆشەویستی ژن بۆ مێرد پەیوەندییەكی ئەوتۆی بەرێكخستن و ماڵدارییەوە نییەوناجۆرن، هەركە ماڵێك ئەبینم كارو باری بەچاكترین سەلیقەو ڕێكخستنەوە بەرێوە ئەچێت دەسبەجێ هەست بەوە ئەكەم، عەشق و خۆشەویستی ژن بۆ پیاو و بەپێچەوانەو لەو ماڵەدا بەساردی ئەگەڕێ ، پاشان عەشقی گەرم و گوڕ زۆر جار بوار بۆ ڕێكخستن و دیقەت ناهێڵێتەوە، هەرژنێك لەناخەوە مێردەكەی خۆش بوێت هیوا خوازی خۆشی كامەرانی ئەو بێت هەرگیز لەئاست ڕێكخستن و جوانكاری ماڵدا لۆمەو سەرزەنشتێكی ناكات ..

### سێیەم :

بـۆرابردوو بەهیمـمـەت بـە، ژنانێـك كـەبۆ مێردەكانیـان عەشـق و خۆشەویستی دەر نـەبڕن هـەرگیز لەهاوسـەرداریدا چـاوەڕوانی كاردانـەوەی هـاو وێنەی بەرامبەر ناكەن ، گەر مێردەكەت لەناكاو لەدەمی دەرچو ئەمڕۆ یـەكێك لەو كچانەی بینیـوە كەپێشـتر هـاوڕێی بـووە، خێـرا ئـەو هەلـە مـەقۆزەرەوە و پرسیارێكی ناراستە مەكە ئایا ئێستاش هەر قژی ڕەنـگ ئـەكات تـاوەكو كچـە لاوێك خۆی بنوێنێ...؟

باوكم پێش ئەوەی بێتە هاوسەری دایكم پەیوەندی لەگـەڵ كچـێكی قـژ زەرددا هەبووە، بیرمدێت هەركاتێ دایكم لەجوانی و قەشەنگی ئەو كچـە قسـەی دەكرد، باوكم زەردەخەنەیەكی شەرمەزاری ئاوێزانی لێوەكانی ئەبوون، باوكم پێـی وابوو كەدایكم لەو جوانترە، دایكیشـم ئەمـەی چـاك ئـەزانی، بـەڵام كـە بـاوكم هەستی ئەوەی ئەكرد ئەوا دایكم ستایشی سەلیقەو هەڵبـژاردەكانی ئـەو ئـەكات گەز گەز باڵای ئەكرد .

### چوارەم :

لەبەرامبەر خزمەتگوزاریەكانی پیاودا ستایش بكـە، هەنـدێك ژن دەرك بەوە ناكات مێردەكەی چ خزمەتگوزارییەكی بچوكو هاوشان كاریگەری بۆ ئەنجام ئەدات، سەردەمێك وامئەزانی مێردەكەم لەكارو باریماڵداریدا زۆردەسەپاچـەیە تەنانەت ئەبێ ئاوی ئاسایی بكەین بەدەمیەوە، واڕێكەت ئەو سـەفەری كـرد بـۆ ئـەوروپا، كـە جێـی هێشـتم و تـەنیا كـەوتم تێگەیشـتم هـەموو ڕۆژێـك چـۆن خزمەتگوزاریەكی بۆ ئەنجام داووم ناچام خۆم بیانكـەم مـەخابن بەرامبـەری ئـەو هەموو خۆشەویستی و كۆمەك كردنە سوپاسگوزار نەبووم .

☜ **پێنجەم:**

هەوڵبدە لەكێشەو گرفتەكانی بگەیت ، ئەزمون بۆی سەلماندم بۆ هەرژنێك بەرگری لەبەرامبەر باودۆخی نەگونجاودا گەلێك سەختە، نمونەش : لەگەڵ مێردەكەمدا تازە هاوسەرداریمان كردبوو بۆ بەسەر بردنی مانگی هەنگوینیمان گەشتێكمان كرد ، بەڵام مێردەكەم لەهەفتەی یەكەمەوە بڕیاربوو وانەی پۆلەكانی لەئەستۆ بگرێت ، منیش بەتەواوی بۆ عەشق و سۆزو هەستەكانی شاعیرانەی ئەو خۆمم ساز دابوو خەونی زێڕینم پێوەئەبینی كەچی بینیم تەواوی ڕۆژ لەژوری نوتێلێكدا تاكو تەنیا جێم دەهێڵێت لە چوارچێوەی دیوارێكی ڕەق و تەق و چەند بەستەیەك دیاری و خەڵاتی بوك و زاوایی هێندە بێزار بووم جارجار دەستم دەكردە گریان، لەهەمووی بەدتر كاتێ ئەگەڕایەوە لەنوسین و خوێندنەوەدا نوقم ئەبوو، گەر بمویستایە بدوێم ئەبوایە پێشتر داوای بوارو كاتم لێبكردایە، كەبواریشی پێئەدام بەقین و توڕەبوونەوە كاتەكەیم ئەكوشت، ئەمرۆش بیرلەخۆم ئەكەمەوە بەڕاستی بەخت یاوەرم بوو ئەگینا ئەو مافی خۆی بوو جل و جانتاكەم بۆكۆ بكاتەوەوبیداتە دەستم و بڵێت : خوات لەگەڵ بفەرموو بۆلای دایكت تاكەمێكی تر گەورە ئەبیت چونكە هاوسەرداری بۆكەسی گەورەو ژیرە نەك بۆ منداڵ و مەزم...!

ئایا پیاوانیش لەبەرامبەر خۆشەویستی و تێگەیشتن و هەست و سۆزداری ژندا سوپاسگوزارو منەتبارن ...؟

ئایا كاتێك ژنێك بۆ خۆشی و كامەرانی مێردەكەی دائەبڕێت و خودی خۆی فەرامۆش ئەكات تەواوی بیرو ئاواتی سەركەوتن و ڕەزامەندی مێردەكەیەتی دەركی بەم ڕاستییەكردووە یان ...نە ؟

بێگومان ... بەڵێ

من ئێستا نامەی پیاوێکی بەختەوەرم لەبەردەستدایە کە دەروونناسێکی زانستە کۆمەڵایەتیەکانە، لێرەدا ووتەکەی ئەوتان وەك خۆی بۆ ئەگوێزمەوەو کۆتایی بەدەمەتەقێکانمان ئەهێنم و هیوای سەرکەوتن و داوای لێبوردن ئەخوازم و ماڵتان ئاوا ....

(... لەوانەیە من لەهاوسەرداریدا لەزۆربەی پیاوانی دیکە بەختەوەرترو کامەرانترم، گەورەترین ستایش و پیاهەڵدانێك بۆ هاوسەرەکەی خۆمی بکەم ئەوەیە، گەر بڕیار بێت بەم ئەزمون و هۆشمەندیەمەوە بمگەڕێننەوە بۆ٣٢ ساڵ بەرلەئێستا بێگومان بن سەرلەنوێ هاوسەرداری لەگەڵدا ئەبەستمەوە، لەژیانـدا هەر سەرکەوتنێك یاودرم بوبێت ئەو سەرکەوتنەم خۆی بەقەرزاری ئەو ئەزانێت، گەر سەرکەوتن باڵی عەشق و خۆشەویستی ئەبوایە چەند کاڵ و کرچ دەبوو، بەبێ عەشق و خۆشەویستی هەرچی سەروەت و سامان و پلەو پایەهەیە وەك خۆڵ و خاشاك بێ بەهاو نرخە، گەر هاوسەرەکەت پشت ئەستوری فیداکاریەکانی تۆ بێت دڵنیابە سەرکەوتن لەژیانیدا هەزار بەرامبەرە..

**کۆتایی**

لەوانەیە من لە هاوسەریدا لەزۆربەی پیاوانی دیکە بەختەوەر تر و کامەرانتر بم . گەورەترین ستایش و پیاهەڵدانێك بۆ هاوسەرەکەی خۆمی بکەم ئەوەیە ئەگەر بڕیار بێت بەم ئەزموون و هۆشمەندیەمەوە بمگەڕێننەوە بۆ ٣٢ساڵ بەرلە ئێستا بێگومان بن سەرلەنوێ هاوسەر داری لەگەڵدا ئەبەستمەوە ، لە ژیاندا هەر سەرکەوتنێك یاوەرم بوبێت ئەو سەرکەوتنەم خۆی بە قەرزاری ئەو دەزانێت ، گەر سەرکەوتن باڵی عەشق وخۆشەویستی نەبوایە چەند کاڵ و کرچ دەبوو .

بەبێ عەشق و خۆشەویستی هەرچی سەروەت و سامان و پلە و پایە هەیە وەك خۆڵ و خاشاك بێ بەهاو نرخە .

گەر هاوسەرەکەت پشت ئەستوری فیداکارییەکانی تۆ بێت دڵنیابە سەرکەوتن لە ژیاندا هەزار بەرامبەرە ....





لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا